# خواناسی

## بەڵگەکان لەسەر بوون و کاملی

خوا سبحانە وتعالی


م. علی خان

نوسینەوەی

عبدالله محمد




خانی

# خواناسی

## بەلگەکان لەسەر بون وکاملی خوا ﷻ


خستنە سەر کاغەز

عبدالله محمد



چاپی یەکەم

١٤٣٦ك

ناوی کتێب: خواناسی، بەڵگەی بون وکامڵی خوا ﷻ

نوسەر: مامۆستا علی خان

تایپ: عبدالله محمد

بەرگ : م.فلاح حسن

سەرپەرشتی چاپ: کازم عبدالله

نۆرە وساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٦

شوێنی چاپ : سلێمانی – چاپخانەی زانا

بڵاوکردنەوە: کتێبخانەی ئیمان (سلێمانی) ژێر کەشتی نوح، ژ.م: ٧٥٠١١٤٥٢٥٧

*** *** ***

بنکەی بڵاوکردنەوە:

١.کتێبخانەی ئامۆژگاری(ڕانیە).

٢.کتێبخانەی دێرین(سۆران).

٣.کتێبخانەی سوهەیب(کۆیە).

٤.سەنتەری ئامۆژگاری(سلێمانی).

٥. سەنتەری کارزان (چەمچەماڵ).

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على نبينا محمد، وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد:

خوێنەرانی بەڕێز...

ئەم نامیلکەیەی بەردەستان بریتیە لە دوو وتاری هەینی مامۆستای ڕێزدار: «م.عەلی خان» -خوا بیپارێزێت-، بە ناونیشانی: «خواناسی، بەڵگەکان لەسەر بون وکامڵی خوا ﷻ»، لەبەر گرنگی وبەکەڵکی بابەتەکە -بەتایبەتی بۆ ڕۆژگاری ئەمڕۆمان- زۆر پێویست بوو بنوسرێتەوە وبکرێت بە پەرتوك بۆ ئەوەی خەڵکێ زیاتر، سودی لێ ببینێت، منیش سوپاس بۆ خوا نوسیمەوە وخستمە سەر کاغەز، پاشان مامۆستای بەڕێز پێداچونەوەی بۆ کرد وبە پێی پێویست دەستکاری کرد.

جا هەرچیشم بۆ زیاد کردوە لە نێوان دوو کەوانەی لەم شێوەدا [ ] دامناوە، یا لە کۆتاییەوە نوسیومە [ئامادەکار].

هیوادرام ئەم کارەمان ببێتە مایەی ڕەزامەندی خوای میهرەبان وپاشان سود بەخشیش بێت بۆ ئێوەی خۆشەویست.

لەکۆتایدا داواکارم لەخوای پەروەردگار بیکاتە توێشووی قیامەتمان ونیەتمان پاك بکاتەوە ولە تاوانەکانمان ببورێت .

والحمد لله رب العالمين ..

**عبداللّه محمد**

# سەرەتا

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴾ [آل عمران:١٠٢].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴾ [النساء:١].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴾ [الأحزاب:٧٠-٧١].

أما بعد، فإن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد، وشر الامر محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار[1].

---

[1] ئەمە پێی دەوترێ «خطبة الحاجة» كە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە وتاری دەست پێدەكرد، هاوەڵانێشی فێری ئەمە دەكرد، ئەمە گێڕدراوەتەوە لە شەش هاوەڵ ﷺ نموونە: مسلم في «الصحيح»: (١٥٦/٦، ١٥٣-١٥٧ مع -

بەڕاستی نەزانین هەرچەند دەرەنجامەکانی گەورە بن، ئەکرێ چاپۆشی لێبکرێ، مرۆڤ گومانی لە هەر شتێکدا هەبێت، لەمەڕ هەر شتێك جەهل ونەزانی هەبێت دەکرێت لێی خۆشببی، دەکرێ تا ڕادەیەك سەیر نەبێت، بەڵام ئەوەی جێی سەیرە ومایەی قەبوڵکردن وچاوپۆشی لێکردن نیە، مرۆڤ جەهل ونەزانینی هەبێت بەرامبەر بە پەروەردگارەکەی، بەرامبەر بەو بەدیهێنەرەی بەدیهێناوە، لە ئاست ئەو دروستکەرەی دروستیکردوە! چەند ناشیرینە مرۆڤ خالق ودروست کەرەکەی خۆی نەناسێت ونکۆڵی لە بونی بکات!

گەورەترین عار وسەرشۆڕیە دوای پێبەخشینی عەقڵ وژیر وهۆش پاشان مرۆڤ خوای خۆی نەناسێت وئاژەڵ ئاسا بژیت، بەڵکو گومڕاتر وخراپتریش!

---

=شرح النّووي)، وأبو داود في السنن: (١/٢٨٧) رقم (١٠٩٧) ، والنسائي في «المجتبى»: (٣/١٠٤- ١٠٥)، والحاكم في «المستدرك»: (٢/١٨٢-١٨٣)، والطيالسي في «المسند»: رقم (٣٣٨)، والبيهقي في «السنن الكبرى»: (٧/١٤٦) و(٣/٢١٤)، وابن ماجه في «السنن»: (١/٥٨٥). [ئامادەکار]

ناخر هەمو شتێك بە ئاژەڵانیشەوە پەروەردگاریان دەناسن وتەسبیحاتی دەکەن، بە شێوەیەك کە ئێمە درکی پێناکەین.

دەزانی بۆ؟ لەبەر ئەوەی عەقڵیان هەبوە وبیریان پێنەکردۆتەوە وکوێیان هەبووە وهەقیان پێنەبیستووە وخۆیان لە ئاستیدا کەڕ کردوە.

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴾ [الأعراف:١٧٩]. واتە: «سوێند بێ زۆرێکمان دروستکردوە لە بۆ ئاگر لە جنۆکە ومرۆڤەکان: دڵیان هەیە بەڵام بیری پێناکەنەوە وتێناگەن، چاویان هەیە بەڵام بەڵگە ونیشانەکانی خوای پێ نابینن، گوێیان هەیە بەڵام هەقی پێنابیستن تا تێرامێنن»

لە کاتێکدا هەمو شتێك بەندایەتی بۆ خوا دەکات، بە ئاژەڵانیشەوە.

## بێباوەڕ لە ئاژەڵ گومڕاترە

بۆیە پەروەردگار جیهانیان باسی بێباوەڕان دەکات، بە لە ئاژەڵ خراپتر دەیان شوبهێنێ، ئەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن

فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍ﴾ [الحج:١٨].

واته: ((ئەی پەیامبەر ﷺ نەتزانیوە هەرچی لە ئاسمانەکاندایە لە فریشتەکان وهەرچیش لە زەویدایە، سوژدە بۆ خوا دەبات وملکەچی خوایە، لە دروستکراوەکان وخۆر ومانگ وئەستێرە وشاخەکان ودارەکان وئاژەڵان، زۆرێکی خەڵکیش بە سەرپشکی خۆیان سوژدە بۆ خوا دەبەن، بەڵام زۆریکیشیان سزای خوایان لەسەر چەسپاوە)).

جا ئەفەرموێ: خۆر سوژدە بۆ خوا دەبا، مانگ سوژدە ئەبا، دارەکان سوژدە بۆ خوا ئەبا، ئاژەڵانیش سوژدە بۆ خوا دەبەن، شاخەکانیش هەروەها سوژدە بۆ خوا دەبەن)).

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ﴾ [النور:٤١]، واتە: ((ئەی پەیامبەر! ﷺ نەتزانیوە هەرچی لە ئاسمان وزەویدایە لە دروستکراوەکان هەموی تەسبیحاتی خوا دەکەن، باڵندەکانیش لە ئاسماندا

باڵەكانیان كردۆتەوە وتەسبیحاتی خوا دەكەن، هەر هەموی خوا فێری كردن چۆن تەسبیحاتی بەدیهێنەرەكەیان بكەن)).

ئالێرەوە بۆت ڕوندەبێتەوە بۆ كافر لە ئاژەڵ گومڕاترە؟ چونكە ئاژەڵ پەروەردگاری دەناسێت وسوژدەی بۆ دەبات، بەڵام ئەم بێباوەڕە پەروەردگارەكەی خۆی ناناسێت، بۆیە شایستەی ئەوەیە كە پێیان بوترێ: لە ئاژەڵ گومڕاتر.

﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ﴾ [الأعراف:١٧٩]. واتە: ((ئەو بێباوەڕانە وەكو ئاژەڵ ئاوهان، كە نە تێدەگەن لەوەی پێیان دەوترێ، نە حاڵی ئەبن لەوەی دەیبینن، نە بە دڵیشیان عەقڵی ئەوەیان هەیە چاك وخراپ لەیەك جیا بكەنەوە))، جا دەفەرموێ: ((بەڵكو گومڕاتر لە ئاژەڵ)).

بەڵێ، كە مرۆڤێك گومڕا بوو پەروەردگاری خۆی نەناسی ونكۆڵی لە بونی كرد، ئەوسا بەڕاستی زوڵمت لێنەكردوە كە پێی بڵێی: ئاژەڵ، بەڵكو گومراتر لە ئاژەڵ.

ئەوەتا یەكێكیان -كە ئیلیا ئەبو مازیە- ئەڵێ:

جِئْتُ، لا أعلَمُ مِن أيْنَ، ولكنّي أتَيْتُ

وَلَقَدْ أبصَرتُ قُدَّامي طَريقاً فَمَشَيْتُ
وسَأبقى مَاشِياً إن شِئتُ هذا أمْ أبَيْتُ
كيفَ جِئتُ؟ كيفَ أبصَرْتُ طريقي؟
لَستُ أدري!

هاتوم، نازانم له کوێوه، بەڵام ئیتر هاتوم
له پێشمەوه ڕێگەیەکم بینی، منیش ڕێمکرد
هەر ئەبێ ڕێ بکەم، بمەوێ یا نەمەوێ
چۆن هاتوم؟ چۆن ڕێگاکەم بینی؟
نازانم!

أجَديدٌ أم قَديمٌ أنا في هذا الوُجودْ
هَل أنا حُرٌّ طَليقٌ أم أسيرٌ في قيودْ
هَل أنا قَائِدُ نفسي في حَياتي أم مَقُودْ
أتمنَّى أنَّني أدري ولكنْ...
لَستُ أدري!

من تازەم یا کۆنم لەم گەردونەدا
من ئازادم یا بەندکراو له کۆتوبەند
من خۆم بەڕێوه ئەبەم یان بەڕێوەم ئەبەن
ئاواتمه که بزانم بەڵام...

نازانم!

أتُراني قَبلَما أصبَحتُ إنساناً سَويّا

أتُراني كُنتُ مَحواً أمْ تُراني كُنتُ شَيَّا

ألِهذا اللُّغز حَلٌّ أم سَيَبقى أبدِيَّا

لَستُ أدري... وَلِماذا لَستُ أدري؟

لَستُ أدري!

خۆزگە ئەمزانی پێش بە مرۆڤ بونم

تۆ بڵێی من هیچ بوبێتم یان شتێك

ئەم مەتەڵە جوابی هەیە یان هەر دەمێنێتەوە

نازانم ... ئەی بۆچی نازانم؟

نازانم!

وەکو خوای مەزن ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَـٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾ [محمد:١٢]. واتە: «نمونەی ئەوانەی بێباوەڕن لە خواردنیان وڕابواردنیان بە دونیا، وەکو ئاژەڵ وایە چۆن خەم وخەفی تەنها خواردن وئالفەکەیەتی، جا دۆزەخ جێگایانە».

جا لەم کتێبە بچکۆلە لە قەبارە، وگەورە لە ناوەڕۆك -بە یارمەتی خوا ﷻ- وەڵامی ئەو گومان وشوبهانە دەدرێتەوە.

## کەس نکوڵی لە بوونی خوا ﷻ نەکردوە

لەبەر ڕونی بەڵگەکان لەسەربوونی خوا -تبارك وتعالى-، بە درێژایی مێژو هیچ گروپ وگەلێك نەبوە نکوڵی لە بوونی خوا بکات، تەنها دەهریەکان وفیرعەون نەبێت، ئەمەش پەروەردگار باسیدەکات کە فیرعەون تەنها بە دەم نکوڵی کردوە نەك بە دڵی قەناعەتی وابوبێ، یانی کاتێك وتویەتی: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾ [القصص:٣٨]، واتە: «خوایەکی تری جگە لە خۆم شك نابەم بۆ ئێوە!»، بەڵام هەر خوا خۆی بۆمان باس دەکات ودەفەرموێت: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ [النمل:١٤]، واتە: «نکوڵیان کرد لەو ئایەتانەی کە پەیامبەر موسا ﷺ بۆی هێنا بوون، بەڵام لە دڵەوە یەقینیان هەبوو کە موسا ڕاستدەکات».

بەڵکو موسا خۆی پێی وت: ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَٰؤُلَاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ بَصَائِرَ﴾ [الإسراء:١٠٢]، واتە: «-ئەی فیرعەون!- سوێند بەخوا باشدەزانی ئەو نۆ نیشانە کەس داینەبزاندوە خوا خۆی نەبێت، دەشزانی من لەلایەن پەروەردگاری ئاسمان وزەوییەوە ڕەوانە کراوم».

هەربۆیە نەبووە بە درێژایی مێژوو، میللەتێك ناسراو بن بە نکولّیکردن لە بونی خوا، تەنها لە سەردەمی زەڕرە ونەوەویدا نەبێت لەم سەدانەی دواییدا، خەڵکانێك چەکەرەیان کرد لەناو میللەتاندا، خەڵکانێکی مادده پەرست، ئینکاری ونکوڵیان لە بوونی خوا دەکرد -جل جلالە-، دونیایان بە مادده دەبینی، وایان لێهات بوو شارێکیان لیّ بەتاڵ نەبوو. بەڕادەیەك مامۆستا لە قوتابخانە بە قوتابیەکانی دەوت: قوتابیەکان! من دەبینن؟ ئەوانیش دەیانوت: بەڵیّ، دەیوت: کەواتە: من هەم.

قوتابیەکان! ئەو تەختە ڕەشە دەبینن؟ ئەوانیش دەیانوت: بەڵیّ، دەیوت: کەواتە: تەختەکەش هەیە، دەیانوت: قوتابیەکان! ئەو تەباشیرە دەبینن؟ ئەوانیش دەیانوت: بەڵیّ، دەیوت: کەواتە: ئەو تەباشیرەش هەیە، ئیتر بەرەبەرە دەیبردن وپێی ئەوتن: قوتابیەکان! ئایا خوا دەبینن؟ دەیانوت: نەخێر! ئەویش دەیوت: دەی کەواتە: خوا نیە.

تا ئەوەبوو قوتابیەك هەستا ووتی: ئەی قوتابیەکان کەس لە ئێوە عەقڵی مامۆستا دەبینیّ؟ وتیان: نەخێر، وتی: دەی کەواتە: مامۆستاکەشمان عەقڵی نیە!!

مولحیدەکانیش باوەڕیان بە خوای خالق وپەرستراوی هەق هەبوو، بەڵام ناویان لێنا: مادده وسروشت، جا ئێمە ئەڵێین: خوا دانایە، خوا دروستکارە، بەڵام ئەوان ئەڵێین: سروشت دانایە ودروستکارە.

بەڵکو شیوعیەکان، سەرکردە ودامەزرێنەرانی مەزهەبەکەی خۆشیان کرد بە پەرستراو وپەرستیان، جا دەیانتبینی لە گۆڕەپانی سوردا لە ڕۆژی تیاچونیدا بە بەردەم لاشەکەیدا تێدەپەڕ دەبون، وسەریان شۆڕ دەکرد لە ئاستیدا -کە خوا بە بەرزی دروستی کردوە- بەمەش کردیان بە پەرستراو، لەبری پەرستنی خالق، ڕۆیشتن مەخلوقێکیان پەرست.

شەیتان ئاوها هەڵیخەڵەتاندن بەس بۆ ئەوەی بەرەو بەهەشت نەڕۆن وبەرەو دۆزەخ بڕۆن.

ئەگەرنا بەڵگە لەسەر بون وتەنهایی وکامڵی خودا لە ژماردن نایەت، هەربۆیە ئەوەی بەڵگەی دەوێت لە نیوەڕۆیەکی سامالّدا، لەسەر هەڵهاتنی خۆر وپلێ: بەڵگەی ئەوە چیە کە خۆر هەڵهاتووە؟ ئەوە پێویستیمان بە بەڵگەیە کە ئەوکەسە عەقڵی هەیە یان نا؟!

هەر بۆیە پەیامبەران -سەڵات وسەلامی خوایان لەسەر بێ-، بە گەلەکانی خۆیان دەوت: ﴿ ۞ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: «ئایا گومان لە بوونی خودای بەدیهێنەری ئەرز وئاسمانەکان هەیە؟!»» پرسیارێکە بۆ دانپێدانان، واتە: نەخێر هیچ گومان لە بونی خوادا نیە. پرسیاریش بەم شێوازە ناکرێ، مەگەر لە کەسێك دانی پێدا بنێ.

ئەوەندە ئەم قەناعەتە لە نێو گەلاندا هەبووە، زۆر جار لە قورئاندا خوای مەزن، بەوەی کە ڕەبب «پەروەردگار»ە، داوای پەرستنی خۆی دەکات -سبحانە-، چەند ئەفەرموێ: «من دروستم کردون ورۆزیم داون، بۆیە عیبادەتیشتان با هەر بۆ من بێ».

هەر بۆیە پەروەردگاری مەزن لە قورئاندا گەلێك جار بانگمان دەکات وسەرنجمان ڕادەکێشێت، وبیرمان دەبات بۆ ئەوەی کە سەرنجی دروستکراوەکانی بدەین، تا خۆی پێ بناسینەوە ﷻ، تا بەهۆی ناسینی خۆیەوە گوێڕایەڵی بکەین وبیپەرەستین، کە هەر

ئەمەش مەبەست وئامانجە لە ئایەتەکان وناردنی پەیامبەران وکتێبەکان ودروستکردنی بەهەشت ودۆزەخ ودانانی تەرازو وهتد...، بۆ ئەوەی عیبادەت وپەرستنمان بۆ خوا بێ بە تەنها.

## بەڵگەکان لەسەر بون وتەنهایی خوا ﷻ

**یەکەم: فیترەت** ((الفطرة)).

فیترەتی مرۆڤەکان بەڵگەن لەسەر بوون وتەنهایی خوا.

**فیترەت:** لە ئەسڵدا واتە بەدیهێنان ودروستکردنی یەکەمجار.

**مەبەستیش لێرەدا:** بریتیە لەو هەستەی لەگەڵ دروستبونی مرۆڤەکان، لە نەفسیاندا دانراوە، کە پێی پەروەرگارەکەی خۆیان دەناسنەوە[1].

جا هەمو هەمو کەسێك بە فیترەتی خۆی، خوای خۆی دەناسێتەوە، وەك لە سەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتوە پەیامبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَد على الْفطْرةِ، فأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ». واتە: «هەموو کۆرپەلەیەك

[1] «(الفَطْر): إيجاد الشيء ابتداء وابتداعًا... و(الفطرة): الخلقة، وهي من الفطر، كالْخِلْقَة من الخلق في أنها اسم للحالة، ثم إنها جعلت اسمًا للخلقة القابلة لدين الحق على الخصوص، ثم جعلها اسمًا لملة الإسلام نفسها؛ لأنها حالة من أحوال صاحبها، وعليه قوله: قص الأظفار من الفطرة».

لەسەر فیترەت لە دایك دەبێت»، واتە: لەسەر ئەو هەست وتەبعە دێتە دونیاوە کە خوا یەکەمجار دروستی کردوە، لێرەشدا، واتە: ئیسلام.

«فأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ»، واتە: «جا ئەوە دایك وباوکین دەیکەن بە جولەکە یان گاور یان ئاگرپەرست»، سەرنج بدەن باسی ئیسلام ناکات، نافەرموێ: «یان دایك وباوکی دەیکەن بە موسڵمان» بۆ؟ چونکە کە لە دایك ئەبێت لەسەر ئیسلامەتیەکی پاك لە دایك ئەبێت.

وەکو خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموویێت: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ﴾ [الروم:٣٠]، واتە: «ئەی پەیامبەر! بەردەوام بە لەسەر ئەو دینە کە ئەو حەنیفیەت وئیسلامەیە، لە فیترەت وخیلقەتی هەمو کەسێکدا خوا دایناوە، جا دەستگرتنتان بە ئیسلام، دەستگرتنتانە بە فیترەتەوە».

بەڵکو نێردراوی خوا ﷺ -لە فەرمودەیەکی قودسیدا- دەفەرموێ: «خوای مەزن فەرمویەتی: «إِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاء،

فَاجْتَالَتْهُم الشياطين»[١]، واته: «من بەندەکانم بە حەنیفیەت ویەکخوا پەرەستی خولقاندوە ودروستکردوە، بەلاّم شەیتانەکان هاتوون گومڕایانکردن ولەو فیترەتە ڕاستە لایدان».

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: «إني خلقتُ عبادي حنفاء مسلمين»[١]. واتە: «من بەندەکانم بە یەك خوا پەرەستی وموسڵمانێتی دروستکردوە، لە دایکی خۆیان بوون، موسڵمان بوون».

هەروەها پەروەرینمان ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ﴾ [الأعراف:١٧٢]. واتە: «-ئەی پەیامبەر!- باسی ئەو کاتەیان بۆ بکە کە پەروەردگارەکەت، نەوەکانی ئادەمی لە پشتی باوکیان دەرهێنا، جا کردنی بە شاهید بەسەر نەفسی خۆیانەوە لەسەر ئەو تەوحیدەی کە لە دەرونیاندا دایناوە کە هەر خۆی پەروەردگاریانە، پێی وتن: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ دروستکاری ئێوە

---

[١] رواه البخاري: (١٣٨٥) [ئامادەکار].

[١] أخرجه : مسلم ١٥٨/٨ ( ٢٨٦٥ ) ( ٦٣ ) [ئامادەکار].

نیم؟ ڕۆزیدەری ئێوە نیم؟ بەڕێوبەری کاروباری ئێوە نیم؟ گفت ووەعدی لێوەرگرتن، لە وەلآمدا ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ وتیان: بەڵێ، بۆنا، تۆ پەروەردگاری ئێمەی، ﴿شَهِدْنَآ﴾ شاهیدین ودانی پێدا دەنێین، بۆ ئەوەی نەوەك لە قیامەتدا بدەن لە ژێری ونکوڵی لێبکەن)).

مرۆڤ بە فیترەتی قەناعەتی بە الله ﷻ هەیە.

بەڵام دەبینی ئەو فیترەتەی لە ناخیدا هەیەتی، ئەو وەعدەی بە پەروەردگاری داویەتی، وەعد بەخیلاف دەکات وەکو ئەوەی پەروەردگارێك نەبێت ناسیبێتی وگفتی لێوەرگرتبێ کە ئەو پەروەردگاریەتی.

تەنانەت لە شیعری سەردەمی نەفامیدا ((پێش ئیسلام))، شتانێکت بەرچاو دەکەوێت بەڵگەی ئەوەیە بە فیترەتیان زانیویانە ئەو پەرستراوانە نابێ ببەرەستریێ، لەوانە:

عەنتەرە ئەڵێ:

يا عَبلُ أينَ من المَنيَّةِ مَهْربي * إن كانَ ربي في السَّماءِ قَضاها

لەوەو پاشیش لەسەر ئەم بابەتە ئایەت دەهێنینەوە -بە ویستی خوا-.

## ئەی ئەگەر منداڵ وازی لێبهێنێ بێباوەڕ نابێ ولەسەر فیترەتە؟

**لەوانەیە بپرسی:** ئەگەر منداڵ وازی لێبهێنێ، بێباوەڕ نابێ ولەسەر فیترەت دەردەچێت؟

**لە وەڵامدا:** بەڵێ، لەسەر فیترەت لە دایك ئەبێ، کە دەشبینیت منداڵ لادەدات وڕاست وچەپ دەکات، ئەوە ژینگەکەیەتی، کۆمەڵگاکەیەتی، دەوروبەرەکەیەتی، دایك وباوکیەتی، قوتابخانەیە، ڕاگەیاندنەکانە،.. هتد، ئەگەرنا منداڵ وازی لێبهێنی بەخۆیەوە بەتەنها، فیترەت پاکێکی موسڵمان دەردەچێت.

جا ئەگەر زەمانەتی شەیتان بکەی دەستی بۆ نەبات ووەسوەسەی بۆ نەکان ولە خشتەی نەبات، منیش زەمانەت دەکەم لەسەر فیترەت دەردەچێت!

﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴾ [العنكبوت:٦٥]، واتە: «شەیتان وتی: بە دەسەڵاتی تۆ قەسەم، ئەبێت لە خشتەیان بەرم تەنها بەندە بێخەوشەکانت نەبێت».

پەیامبەریش ﷺ ئەفەرموێ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنْ الْإِنْسَانِ مجْرَى الدَّمِ» متفق عليه. واتە: «شەیتان وەکو خوێن بەناو لاشەی مرۆڤدا دێت ودەڕوا».

هەروەها قورئانیش باسی وەسوەسەی شەیتانی بۆ کرودین: ﴿ ٱلَّذِى يُوَسۡوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴾ [الناس:٥].

هەروەها هەمو کەسێك قەرینێکی لە شەیتان لەگەڵدایە: ﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَىَّ عَتِيدٌ ﴾ [ق:٢٣].

جا بە فیترەت ئێمە دەزانین کە خوا هەیە، وتاك وتەنهایە.

زۆر جاریش ڕوداو وپێشهاتی وا دێتە پێش، پەردە لەسەر ئەو فیترەتە شاراوە لا دەدات کە ژەنگی تاوان ونەفس وشەیتان سەری گرتوە:

پیاوێك دێتە خزمەت جەعفەری سادق -ڕەحمەتی خوای لێبێت- پرسیاری خوای لێدەکات: جەعفەری سادقیش دەڵێت: ڕۆژێك نەبوە لەسەر کەشتی بیت لەناو دەریادا؟ دەڵێت: بەڵێ، ئەڵێ: هەرگیز ڕووینەداوە بای توند وشەپۆلی سەخت لە کەشتیەکەتانی دابێ وهیچتان بە دەستەوە نەمابێ وبترسن ژێر ئاو بکەون؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە ناخەوە هەستت نەکرد یەکێك

هەیە دەتوانێت ئێستا بە هاناتەوە بێت؟ وتی: بەڵێ. فەرموی: ئا ئەوە خوایە!!

بەڵێ ئەوە دەنگی فیترەتە لە ناخەوە بەرز دەبێتەوە وهاوار دەکات: یا الله فریامان بکەوە.

هەر بۆیە خوای گەورە لە قورئاندا سەرزەنشتی موشریکەکانی کۆن دەکات، دەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُسَيِّرُكُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا۟ بِهَا جَآءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَآءَهُمُ ٱلْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ ۙ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنْ أَنجَيْتَنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾ [یونس:٢٢]، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ [العنكبوت:٦٥]، واتە: «کاتێك کە سواری کەشتی دەبن بە بێخەوشی نزا دەکەن ودەپاڕێنەوە لە خوا، ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ بەڵام کاتێك کە خوا ڕزگاریان ئەکات وئەگەنە وشکانی، ئەوسا دەستدەکەنەوە بە شیرك دانان بۆ خوا».

بەڵێ، کە شەپۆلەکە دێت وئەدات لە کەشتیەکە، ئەوسا ئەشدا لە ژەنگی ئیلحاد ولایدەدا، بۆیە هاوار دەکات: یا الله یا الله.

بەڵێ، هەمو مرۆڤێك لە ناخیدا خوا دەناسێت، بە فیترەتی یەك خواناسە، ئەوە عامل ((فاكتەر))ە دەرەكیەكانە لای دەدات بۆ هاوەڵ پەیداكردن، یان هەر خوا نەناسین.

**دووەم: نیشانەكانی خوا ((آیات الله)).**

بەڵێ، بە ئایەتەكانی خوا، باوەڕمان پێ هێناوە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ [فصلت:٥٣]، واتە: ((بێگومان نیشانەكانی خۆمان پیشانی ئەو بێباوەڕانە دەدەین: ﴿فِى ٱلْـَٔافَاقِ﴾ لە ئاسۆكانی دەوریاندا، ﴿وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ولە نەفسی خۆیاشیاندا، تا بۆیان ڕوندەبێتەوە كە قورئان حەقە)).

یانی: لە زەوی وئاسمان وشاخەكان ودارەكان وبەردەكان وئاژەڵەكان، هەروەها گیاندار وبێگیانەكان وبەرز ونزمەكان، گەورە وگچكەكان، هەروەها لە نەفسی خۆشیاندا نیشانەی جۆراوجۆریان پیشان دەدەین تا جوان بۆ یان ڕون دەبێتەوە كە پەروەردگار وپەیامبەرەكەی وئیسلام هەقە.

بۆچی؟ ئەوسا: ﴿لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ﴾ [الأنفال:٤٢]، ((بۆ ئەوەی هەرکەس مرد وهەرکەیش ژیا، دوای ئەوە بێت کە بەڵگە وحوججە ونیشانەی خوای بینی بێت وبیانوی بڕی بێت، لە قیامەتیشدا بەڵگە وبیانوی بە دەستەوە نەمێنێت بەرامبەر بەخوا، دوای بڵێ: خوایە من نەمزانی)).

هەربۆیە ئایەتەکانی قورئان ڕونن هەروەکو ڕۆژی ڕوناك، وەك پەیامبەر ﷺ دەفەرموێت: «قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا»[1] واتە: ((بێگومان لەسەر ڕێباز ودینێك جێمهێشتون کە سپی وڕونە، بەڕادەیەك شەوی وەکو ڕۆژی وایە))

بۆیە ڕونە، سپیە، ڕەوانە، ڕۆشنە، بۆچی؟ بۆئەوەی کەس بەڵگەی بە دەستەوە نەمێنێت لە ئاست خوا. ئەوەندە سپی وڕونە هەموو عاقڵێك درکی پێدەکات، هەموو ژیرێك لێی تێدەگات.

لەو ئایەتەی پێشوترەوە بۆمان ڕون بویەوە کە ئایەتەکانی خوا، دوو جۆرن:

---

[1] أخرجه ابن ماجه (٤٣) والحاكم (٩٦/١) وأحمد (١٢٦/٤) وهو في الصحيحة: (٩٣٧).

**١. ئایەتەکانی دەرون «آيات النفس»:** لە ئایەتەکانی خوا، نەفسی مرۆڤە، نەفس نیشانەیەکە لە نیشانە مەزنەکان لەسەر بوون وتەنهایی خوا، خودا کاربەجێ ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ [الذاريات:٢١] واتە: «نەفسی خۆشتان، چەندین بەڵگە ونیشانەی دەسەڵاتی خوای تێدایە، ئایا نابینن؟!»، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴾ [الشمس:٧] واتە: «سوێند بە نەفس وتەواوکردنی دروستکردنەکەی لەلایەن خواوە»، بۆیە گەر مرۆڤ لە نەفسی خۆی وردبێتەوە وچی تێدایە لە سەیر وسەمەرەی کارەکانی خوا، ئەوا ڕێنمونی دەکەن بۆ ئەوەی کە پەروەردگارێکی دروستکەر ودانا وشارەزای هەیە، لەکاتێکدا مرۆڤ ناتوانێ ئەو دڵۆپەیە دروستبکات کە لێی دروستبوە؟ یان بیکات بە پارچە خوێن، یان ئەم خوێنپارە بکات بە گۆشتپارە، یان ئەم گۆشتپارە بکا بە ئیسك، یان ئەو ئێسکە، گۆشت پۆش بکات؟

**٢. ئایەتەکانی ئاسۆ «الآفاق»:** هەرکەسێك وردبێتەوە لە ئاسۆکان وچی لەم گەردونەدا هەیە لە ئاسمان وزەوی، ولەوەی لە ئاسماندایە لە ئەستێرە وهەسارە وخۆر ومانگ، ولەوەی لە زەویدایە لە شاخەکان ودارەکان ودەریاکان وڕوبارەکان، وچۆن شەو وڕۆژ زەوی دادەپۆشن، وبەڕێوەچونی هەمو ئەم گەردونە بەم

سیستەمە وردە، هەمو ئەمانە پێی ئەڵێن: ئەم گەردونە دروستکەر وبەدیهێنەرێکی هەیە، وکاروبارەکانی بەڕێوە ئەبات، بۆیە ژیر هەتا وردبێتەوە لەم دروستکراوانە وزیاتر تێڕامانێت لە بونەرەوە سەیر وسەمەرەکان، ئەوسا دەزانێت ئەمانە هەموی بەڵگەی بوون وتەنهایی خوایە.

لەوەو پاشیش باسی ئەو چیرۆکە دەکەین کە لەگەڵ پێشەوا ئەبو حەنیفەدا ڕو دەدا.

کەواتە: رێکی ئەم گەردونە و وردی لە دروستکردنی، وبە کامڵی خولقاندنی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا خوا دروستیکردوە وبەدیهێناوە تاك وتەنهایە هاوبەشی نیە.

خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ [آل عمران:١٩٠-١٩١]. واتە: «بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان وزەویدا، ولە بەدوای یەکدا هاتنی شەو ورۆژ، وجیاوازیان لە کورتی ودرێژیدا، لە هەمو ئەمانە بەڵگە ونیشانەی گەورە هەیە لەسەر بوون وتەنهایی خوا بۆ خاوەن

ـەقڵە ساغەکان، ئەوانەی کە بیر لە نیشانە وبەڵگەکانی خوا دەکەنەوە وئەڵێن: پەروەردگارا ئەمانە دروستکراوی تۆن وبێهودە دروستت نەکردون، پاکی بۆ تۆ شت بۆ گاڵتە وگەپ دروست بکەیت، دەسا خوایە لە دۆزەخ بمان پارێزە».

## زەوی

سەرنجی زەوی بدە، هەم خڕە وهەم دەشسوڕێتەوە! بەڵام کەسیش بەرنابێتەوە، خاکەکەی ژێریشمان نالەرێتەوە.

هەروەها تەماشای کێشی زەوی بکە! ئێمە موگناتیسمان بینیوە کە ئاسنی ڕاکێشاوە بەڵام ئەم موگناتیسەی زەوی زۆر سەیرە! هەموو شتێك دەکێشێ دار وبەرد ومرۆڤ وهەموو شتێك ڕادەگرێت، کێشێك بە ئەندازەیەکی گونجاو، ئەگەر ئەو کێش وموگناتیسە نەبێت هیچ کەس لەسەر زەوی ڕانەدەوەستا، ئەگەریش کێشەکەی لەوە بەهێزتر بوایە، هیچ نەدەجولا وژیان ڕادەوەستا، سبحان اللّٰه! ئاخر خۆ ئەمە لە خۆوە نەبوە!

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴾ [الأنبياء:١٦]. واتە: «ئێمە ئاسمان وزەوی وئەوەی نێوانیان بۆ گەمە وگاڵتە دروستمان نەکردوە».

هەروەها دەفەرمویت ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ﴾ [ص:٢٧]، واتە: «ئێمە ئاسمان وزەوی وئەوەی نێوانیانمان بە بێهودە وبەتاڵ وباتڵ دروست نەکردوە، ئەوە کافرەکان وا گومان دەبەن».

## دەریا

توخخوا تێڕامان لە دەریاکان خوامان پێ ناناسێنێت؟

ئەو هەمو گیاندارانەی تێیدایە؟

گیانداری وا، تەنها لە دەریادا هەیە.

ئەو هەمو گەوهەر ومرواریانەی تێیدایە؟

دوو دەریا دەبینی، ئاوەکانیان تێکەڵ نابن، ورەنگ وتامیان جیاوازە.

سەرنج بدە چۆن پان وبەرین وبەرفراوانە.

لە ئێراندا ڕوباری وا هەیە کە ئەگات بە دەریا، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێڕەوەی پێیدا هاتووە.

ورووباری ئەمەزۆن، ئاوی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی بە درێژی سەدان کیلۆمەتر شیرین دەکات، وتێکەڵیش نابێت بە ئاوی ئۆقیانوسەکە!

وئاوی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی ئەگاتە دەریای سپی، ئاوی دەریای سپی ئەکەوێتە خوار لەبەر قورسیەکەی وزۆری خوێکەی، وئاوی ئۆقیانوسەکەش ئەکەوێتە سەرەوە.

هەروەها ئاوی دەریای ڕەش تێکەڵی ئاوی دەریای سپی نابێت کە ئەگات پێی، بەڵکو دوو ڕێڕەوی پێکەوە لکاوی لەیەك جودای هاوسێ پێکدەهێنن، ئاوی دەریای ڕەش ئەکەوێتە سەرەوە وبەرەو دەریای سپی ئەڕوا لەبەر ئەوەی سوکترە، وئاوی دەریای سپیش ئەکەوێتە خوارەوە وبەرەو دەریای ڕەش ئەڕوا!! پاکی بۆ ئەو خوایەیەی ناهێڵێ تێکەڵ بن!

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾ [الفرقان:٥٣]. واتە: «ئەو خوایەی خۆتان بناسن، کە دوو دەریا تێکەڵ دەکات وبەربەستێکی لە نێوانیان داناوە ناهێڵێ تێکەڵ بن».

زانست ئەڵێ: لە قوڵی ((٦٠م)) شەست مەتر، لە بن دەریا هەمو شتێك تاریك ئەبێت. بەڵام ئەو گیاندارانە چۆن ژیانیان ئەگوزەرێنن لەو تاریکیەدا؟ بەڵێ، خوا مۆلیدەیەکی پێداون روناکیان پێدەبەخشێت، بە هۆیەوە دەتوانن دەوربەری خۆیان روناك بکەنەوە وبژین، ﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾ [النور: ٤٠].

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾﴾ [الحج: ٦٥]، واتە: ((ئایا نابینن کە چۆن خوای گەورە شتەکانی سەر زەوی بۆ موسەخەر ورام کردون، لە ئاژەڵان وروەك ودرەختەکان وگیاندار وبێگیانەکان، هەروەها کەشتیەکانی لە دەریادا بۆ ئاسان کردون بە توانا ودەسەڵات وفەرمانی خۆی، خۆتان وشتەمەکەکانتان بۆ دەگوازنەوە بۆ هەر شوێنێك خۆتان ویستتان لێبێ، هەر خۆیشی ئاسمانی راگرتوە بۆ ئەوەی بەر نەبێتەوە مەگەر بە ئیزنی خۆی، بەراستی خوا زۆر نیان ومیهرەبانە لەگەڵ خەڵك کە ئەم شتانەی پێ بەخشیون)).

﴿ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ [الجاثية:١٢]. واته: ((خوا -سبحانه- ئەو زاتەیە کە بەحری بۆ ڕام وئاسان کردون، بۆ ئەوەی کەشتی بە ئاسان پێیدا بڕوا بە فەرمان وئیزنی خوا، وبۆ ئەوەی بازرگانی وکەسابەتی تێدا بکەن لە جۆرەها کەسابەت، هەروەها بۆ ئەوەی شوکر وسوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەم کار ئاسانیەی بۆ ئێوە)).

باسی کوێی دەریاتان بۆ بکەم؟ وتت دەریا یانی دەریا! سەیروسەمەرەی وای تێدا واللّٰه بەس خوا پێی دەزانێ!

## درەخت

لێرەشدا تەنها شیعرەکەی مەعروف ڕەسافی دەهێنمەوە، کە ئەوسا لە قوتابخانەکان ئەمە فێری قوتابی دەکرا:

انْظُرْ لِتِلْكَ الشَّجَرَهْ ذَاتِ الْغُصُونِ النَّضِرَهْ

تەماشای ئەو دارە بکە خاوەن لق وبە ڕەونەقە

كَيْفَ نَمَتْ مِنْ حَبَّةٍ وَكَيْفَ صَارَتْ شَجَرَهْ

چۆن لەو تۆوە گەشەی کرد وچۆن بووە ئەو دارە

ابْحَثْ وَقُلْ مَنْ ذَا الَّذِي يُخْرِجُ مِنْهَا الثَّمَرَهْ؟!

بگەڕێ وبڵێ ئەوە کێیە بەروبومی لێدەردێنێ؟!

ذَاكَ هُـــوَ اللّٰهُ الَّـــذِي أَنْعُمُــــــهُ مُنْهَمِـــــرَهْ
ئـــەوە ئـــەو خوايەيـــە كە نيعمەتەكانى زۆر زۆره
ذُو حِكْمَـــــةٍ بَالِغَـــــةٍ وَقُـــــدْرَةٍ مُقْتَـــــدِرَهْ
خـاوەن دانايیـەكی تـەواو ودەسـەلاّتێكی بێكۆتايـە
وَانْظُـرْ إِلَـى الشَّـمْسِ الَّتِي جَـــذْوَتُهَا مُسْـــتَعِرَهْ
تەماشـای خـۆريش بكـە كە تيشـكی بلّێسـەی دێ
فِيهَـــا ضِـــيَاءٌ وَبِهَـــا حَـــرَارَةٌ مُنْتَشِـــرَهْ
هـــەم ڕونـــاكی تێدايـــە هەم گەرمی بلاّودەكاتەوە
ابْحَـثْ وَقُـلْ مَـنْ ذَا الَّـذِي يُخْـرِجُ مِنْهَـا الشَّـرَرَهْ؟!
بگەڕێ وبلّێ: ئـەوە كێيـە ئەو بلّێسەيەی لێـدەردەكا
ذَاكَ هُـــوَ اللّٰهُ الَّـــذِي أَنْعُمُــــــهُ مُنْهَمِـــــرَهْ
ئـەوە ئـەو خوايەيـە كـە نيعمەتەكانی بە لێزمەيـە
ذُو حِكْمَـــــةٍ بَالِغَـــــةٍ وَقُـــــدْرَةٍ مُقْتَـــــدِرَهْ
خـاوەن دانايیـەكی تـەواو ودەسـەلاّتێكی نەبـەزە

## خۆر ومانگ

تەماشا دەكەيت، هەردوكيان بەشێوەكی ڕێكوپێك وڕێكخراو لەو شوێنەی بۆيان دياريكراوە هەڵدێن وئاوا دەبن. خۆر

یەکدانەیە، ئەگەر دوان بوایە ژیان نەدەما، مانگ یەکدانەیە، دوان بوایە یان ڕوناکی زیاتر بوایە شەوی زیاتر ڕوناك دەکردەوە ژیان تێکئەچو. لەو شوێنانەی دیاریکراوە لانادەن، بەڵکو ئەوەندە بە ڕێکی هەڵدێت وئاوا ئەبێت، خەڵك ساڵ ومانگەکانی پێدەژمێرن وبە خۆریش ڕۆژەکان دەژمێرن، ئا ئەم ڕێکی ونیزامە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی لە خۆوە نەبووە؟!:

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبًّا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعۡنَٰبٍ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرٍّ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾ [يس:٣٦-٤٠].

واتە: «ونیشانەیەکی لە نیشانەکانی دەسەلآت وتەنهایی، خوا کە خەڵك زیندو دەکاتەوە: ئەم زەویەیە کە ڕوەکی تێدا نەبو ومردبو، بە داباریني باران زیندومان کردەوە، بە هۆیەوە جۆرەها ڕوەکمان ڕواند کە خۆیان وئاژەڵەکانیان لێی دەخۆن، دەی مادام

بە ڕوەك، زەوی زیندو كردەوە، كەواتە خەڵكیش زیندو دەكاتەوە
* ولە زەویشدا جۆرەها باخ وباخاتی داناوە لە خورما وترێ،
وچەندەها كانی وچاوگی تێدا تەقاندوە بۆ ئاودانی ئەو باخ
وباخاتانە * هەمو ئەمانە بۆ ئەوەی خەڵك لە بەروبومەكەی بخۆن
وبەبێ ئەوەی هەوڵ وماندوبونی خۆیان بێت، دەی شوكری خوا
ناكەن لەسەر ئەو نیعمەتانەی كە لە ژماردن نایەت؟! * پاكی بۆ
ئەو خوایەی كە نێر ومێی دروستكردوە لە ڕوەكە فرە چەشنەكانی
خاكدا، وهەروەها لە خۆشیان نێر ومێی دروستكردوە، ولەو
دروستكراوەنەشی كە ئێوە نایزانن * هەروەها نیشانەیەكی تر
بۆیان لەسەر بون وتەنهایی خوا، ئەم شەوەیە كە ڕۆژی لێدەكەنین،
لە پڕدا تاریكی باڵیان بەسەردا دەكێشێت * نیشانەیەكی تریش
خۆرە كە دەگەڕێ لە شوێنی چەسپاوی خۆیدا كە خوا بۆی
دیاریكردوە لێی تێپەڕ ناكا، ئەمەش ئەندازەگیری خوای بە
دەسەڵاتە كە كەس بەسەریدا زاڵ نابێ، وخوای زانایە كە زانستی
هیچی لێ ون نابێ * ومانگیش نیشانەیەكە لە دروستكراوەكانی
خوا، خوا كردویەتیە قۆناغ قۆناغ كە بیست وهەشت قۆناغە،
سەرەتا بە باریكی وكزی دەستپیدەكات تا بە تەواوەتی پڕ دەبێت

وئەبێتە بەدر، پاشان دیسانەوە باریك دەبێتەوە، کە لە باریکی وزەردی وچەمینەوەکەیدا وەکو لقی دار خورمای وشکەوە بوی کۆنی لێدێت * هەم خۆر ومانگ وهەم وشەو ورۆژ کاتی بۆ دیاریکراوی خۆیان هەیە وبۆیان نیە لێی لابدەن، نە خۆر بۆی هەیە بگاتە مانگ ورووناکیەکەی بشارێتەوە، یان ڕێرەوەکەی پێبگۆڕێ، ونە شەویش بۆی هەیە پێشی ڕۆژ بکەوێ پێش تەواو بونی کاتەکەی، جا خۆر ومانگ وئەستێرەکان هەر یەکە لە فەلەکی خۆیدا دەڕۆا » سبحان الله.

کەواتە ئەم گەردونە بە سیستەم ونیزامێکی زۆر ورد وموحکەم بەڕێوە دەڕوات ولادانی بۆ نیە لەو بەرنامەیەی بۆی دانراوە مەگەر بە ئیزنی پەروەرینەکەیان.

هەر بۆیە کاتێك فەرمان دەکات ﷻ، دەبینی خۆر لە شوێنێکی ترەوە هەڵدێت ولە شوێنێکی ترەوە ئاوا ئەبێت.

## ئەستێرەکان

تەماشا دەکەیت، چەندەها ئەستێرە لە ئاسماندا هەیە کە لە ژماردن نایەت، چ جوانی وزینەتێکیان بە ئاسمان بەخشیوە؟ چۆن

ڕازاندویانەتەوە؟ هەروەها نەخشەیەکە لە ئاسماندا دەتوانی بەکاری بهێنی بۆ دۆزینەوەی شوێنی مەبەست! تۆ بڵێی ئەوە هەر لە خۆوە وا بوون بە ڕێنما بۆ خەڵك، یان فەرمان پێکراون لەو شوێنەدا بن.

خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ [النحل:١٦]، واتە: «ئەستێرەکانی کردۆتە ڕێنما بە شەوان»، بۆیە وەکو نەخشە بەکار دەهێنرا لە کۆندا.

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ﴾ [الصافات:٦]، واتە: «ئێمە ئاسمانمان ڕازاندۆتەوە بە جوانی، کە بریتیە لە ئەستێرەکان».

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ [فصلت:١٢]، ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ﴾ [الملك:٥] واتە: «بێگومان ئاسمانی دونیامان بە ئەستێرەی گەورەی درەوشاوە ڕازاندۆتەوە».

## گوزەرێکی خێرا بە ناو ئاژەڵاندا

ئاژەڵانیش لە دروستکراوەکانی خودان، بێگومان لێوردبونەوەیان دەتبەن بەرەو خالقەکەیان.

## گوێدرێژ[1]

که نموونه دەهێنرێتەوە بۆ بێعەقڵی، باسی گوێدرێژ دەکرێت، کەچی دەزانێ کامە دەنگی ڕابوەستەیە وکامەش دەنگی ڕێکردنە، ئاخر خۆ ئەمە لە خۆوە نەبوە، کێ فێری کردوە؟

## شێر

جۆرە شێرێك هەیە کە پێیان دەڵێن شێرە بەڕێزەکان، کاتێك کە برسیشی بێت وبەو هۆیەوە نزیك بێتەوە لە مردن، ونێچیرێك ببینێت جگە لە خۆی خەریکە دەیخوات دەمی بۆ نابات، ئەوەندە بەڕێزە! کێ فێری کرد؟!

## هەنگ «مێش هەنگ»

سەیری هەنگ دەکەیت ئەو خانە جوانانە دروست دەکات، کە ئیبن قەیم -رەحمەتی خوای لێبێت- باسی هەنگ دەکات،

---

[1] لەم خاڵانەی ئێستا وپێشو وئەوانەی پاشتریش، ئوسلوبی کورتبڕیم بەکارهێناوە، وەگەرنا زۆر زیاتر هەڵدەگرێت، بۆیە وتم: خێرا.

بەڵکو ئەمڕۆ -لە سایەی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیاوە- ئەوەندە ڕاستی لەمبارەوە دەبینین، کەس نکوڵی لێناکات مەگەر خۆبەزلزان.

دەفەرمویێت: «دەڵێی کتێبی ئیقلیدسیان خوێندۆتەوە لە ئەندازیاری وهەندەسەدا، کێ فێری کردن؟!

## مێروولە

سەیری مێرولە دەکەی بەو قەبارە بچوکەی خۆی، باشە عەقڵی لە کوێی بێت، دڵی لە کوێی بێ، چۆن دروستکراوە بەو وردی ودیقەتە! کەچی بە نموونە دەهێنرێتەوە لەسەر هەوڵ وتێکۆشان وزەحمەتکێشان وماندو بون ورێکی وتەنزیم، کێ فێری کردن؟

تەنانەت دەگێڕنەوە کە پەیامبەر سولەیمان ﷺ جارێك پرسیار دەکات لە مێرولەیەك، دەفەرمویێت: خواردنی ساڵێکتان چەنێکە؟ ئەویش دەڵێ: سێ دانە گەنمە، پەیامبەر سولەیمان ﷺ تاقیدەکاتەوە، ئەڕوا ئەیخاتە ناو قتویەکەوە وسێ دەنکە گەنمیشی تێدا دادەنێت، دوای ساڵەکە سەیر دەکات یەك دەنکە گەنمی لێ خواردوە، پەیامبەر سولەیمان ﷺ دەفەرمویێت: تۆ درۆت لەگەڵ کردم، وتت لە ساڵێکدا سێ دەنگە گەنم دەخۆین، ئەوەتا یەك دانەت خواردوە! مێروەکە وتی: دەترسام مەشغوڵی مەملەکەت

ودەوڵەتەکەت بیت وئەوسا منت لە بیر بچێت، من یەدەگی سێ سالّم کرد!! کێ فێری کرد ؟!

## کۆتر

تەنانەت شافیعی -ڕەحمەتی خوای لێبێ- وتویەتی: ژیرترین ئاژەڵ کۆترە، تەنانەت ئەوسا بۆ نامە ناردن بەکاریان هێناوە.

## سەگ

نمونەی وەفا لە نێو ئاژەڵان بە سەگ دەهێنرێتەوە، تەنانەت جاحز «جاحظ» باسی ئەوە دەکات، ساڵێك لە ساڵەکان تاعونێك داویەتی لە ناوچەیەك، هەموی تیاچوە تەنها کۆرپەلەیەك نەبێت، ئەڵێ: تەماشا دەکەن سەگێك هەمو جارێك شیری پێداوە، بۆیە ئەو چەند ڕۆژە نەمردوە! کێ فێری کرد ؟!

من نامەوێ درێژە بەم خاڵانە بدەم، ئەگەرنا سوێند بێ تەنها ئەم بەشە دەتوانین لە موجەلەدێکدا بەڵکو زیاتریش بنوسینەوە، بەڵکو زانستی ئەمڕۆ شتی وا ئەڵێ، سەیرو سەمەرە.

## ڕێوی

ئەو فێڵ وتەڵەکە زۆرەی لە ڕێویدا هەیە تەنانەت مرۆڤەکان ئەوەیان زۆر فێڵباز بێت، ئەڵێن: ئەڵێی ڕێویە. کێ فێری کرد؟! سەبارەت بە چیرۆکەکانی ڕێوی چی بەسەر خەڵکدا هێناوە ولە گرتنی ئاژەڵاندا چ فێڵانێکی بەکار هێناوە، ئەوە جێگای ئەم کتێبە نیە.

## مشك

سەیری مشك دەکەن، زانایان ئەڵێن: کاتێك دەم ببات بۆ شلەیەك بیخوات ودەمی پێی نەگات، ئەوا بەرد یان شتێك دەبات دەیخاتە ناوی شلەکەوە بۆ ئەوەی بەرز بێتەوە ولێی بخوات! کێ فێری کرد؟!

## مێشولە

ئەو جیهازە بێ وایەرانەی ئەمڕۆ، ئەو تەلەفزیۆن وڕادیۆیانە، هەموی لە مێشولەوە فێری بوین.

با سەرنجتان ڕابکێشم بۆ دوو شاخەکەی سەری، لەکۆندا دەیانوت: ئەوە تەنها هی جوانیە، بەڵام ئێستا دەڵێن: ئەو دوو

شاخەی وەکو ئەڕوێڵ وایە، بەڵکو بابڵێم ئەروێڵ وەکو ئەم دوو شاخەی وایە، کاتێك مێینەکەی بانگی دەکات وبە دەیان مەتر لێیەوە دورە، ئەو دوو شاخەی دەسوڕێنێت، چۆن تۆش ئەروێڵەکە دەسوڕێنیت بۆ ئەوەی وێنەی تەلەفزیۆنەکە جوانتر وڕونتر بێتەوە، ئاوها دەیسوڕێنێت تا وەکو جوان دەنگەکە ببیستێت، کە بیستی بەجوانی، ئەوسا شوێنەکەی دەزانێت وخۆی دەگەیەنێتە مێینەکەی.. هەزاران ساڵ پێش ئەو جیهازە لاسلکیەی ئەمڕۆ، پەروەردگار بە مێشولەی بەخشیوە، کێ دروستی کرد؟ لە خۆوە بوو؟

مرۆڤ چیکردوە جگە لە تەقلیدی دروستکراوەکانی دەروبەری نەبێت، شتێکم پێ بڵێن کە داهێنانی ١٠٠٪ سەد لە سەدی مرۆڤ خۆی بێت، پێشتر نمونەی لەو شێوە نەبو بێت.

بەڵام خوا ﷻ بەدیهێنەری ئەرز وئاسمانە -بەو مەزنی وفراوانیە- بەبێ ئەوەی نمونەی پێشتر هەبوبێ لەو شێوەیە: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ [البقرة:١١٧].

هەموو ئەمانەش بەڵگەی ئەوەن کە خوا ﷻ بە تەنها هەر خۆی پەروەردگارە، هەمو شتێك موڵکی خۆیەتی، خۆی بەڕێوبەرێتی، خۆی خالقێتی.

## فیل

سەیری فیل بکەن لەبەر بەرزی باڵاکەی، وگەورەییەکەی، کاتێك کە دەزێت بە پێوە لەسەر خاکی ڕەقی زەوی نازێت، بەڵکو ئەڕواتە کەناری ئاوێك بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو ئاوەکەوە، بۆ؟ دەترسێت بێچوەکەی بکەوێتە سەر زەویەکی ڕەق ومردار ببێتەوە، چونکە بەرزە، کێ فێری کرد؟

ئەمانە پێمان دەڵێن: خوایەك هەیە وهیدایەتی دروستکراوەکانی داوە.

هیدایەتی خوای مەزنیش بۆ گیانلەبەران بریتیە لە زانینی ئەو شتەی قازانجیانی تێدایە وئەوەشی زیانیانی تێدایە. بۆ مرۆڤەکانیش هەروەها[1].

---

[1] هیدایەتی خواش ﷻ بۆ مرۆڤەکانیش دوو جۆرە :

**یەکەم:** هیدایەتی ڕێنمایی وڕێنیشاندان «**الإرشاد**» کە ڕێگات نیشان دەدات، ئەوە حەقە وئەوە ناحەقە.

﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾

واته: «خوا ئەو زاتەیە هەر شتێك دروستكردنێكى شیاو بە خۆى دروستى كردوە وپێى بەخشیوە وبە جوانترین شێوە خولقاندویەتى، ئینجا ڕێنمایى هەر دروستكراوێكى خۆى كردوە كە سود وەربگرێ لەوەى خوا بۆى دروستى كردوە». بەڵێ ئەوە خوایە -جل جلالە.

الشَّمْسُ وَالْبَدْرُ مِنْ آيَاتِ قُدْرَتِهِ
وَالْبَرُّ وَالْبَحْرُ فَيْضٌ مِنْ عَطَايَاهُ

---

دووەم: هیدایەتى سەركەوتن «التوفیق»، ئەوەى كە سەركەوتوت دەكات ڕێگەى هەق بگریتە بەر.

كە دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ [القصص:٥٦]، واتە: «ئەى پەیامبەر تۆ ناتوانیت هەركەست حەز لێبو هیدایەتى بدەى» یانى: سەركەوتوى بكەیت وڕێگاى هەقى پێ بگریتە بەر، بەڵكو تەنها ڕێنماییت لەسەرە.

كە دەشفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [الشورى:٥٢]، واتە: «بێگومان تۆ هیدایەت دەدەیت بۆ سەر ڕێگاى ڕاست»، یانى: ڕێنموییكارى ڕێى هەقى، یانى: تۆ چرات بەدەستەوەیە، ڕێگە نیشانى خەڵك دەدەیت، ئەما سەركەوتویان بكەى وڕێگایان پێ بگیریتە بەر، ئەوە تەنها لە دەستى خوایە ﷻ.

الطَّيْرُ سَبَّحَهُ وَالْوَحْشُ مَجَّدَهُ
وَالْمَوْجُ كَبَّرَهُ وَالْحُوتُ نَاجَاهُ
وَالنَّمْلُ تَحْتَ الصُّخُورِ الصُّمِّ قَدَّسَهُ
وَالنَّحْلُ يَهْتِفُ حَمْدًا فِي خَلايَاهُ
وَالنَّاسُ يَعْصُونَهُ جَهْرًا فَيَسْتُرُهُمْ
وَالْعَبْدُ يَنْسَى وَرَبِّي لَيْسَ يَنْسَاهُ

خوا ﷻ ئەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ [النمل:٦٠-٦٤].

واتە: «پرسیاریان لێبکە: کێ ئاسمان وزەوی دروستکردوە؟ وبارانی لە ئاسمانەوە دابەزاندوە؟ بەهۆیەوە چەندین باخاتی دڵڕفێنی پێ ڕواندوە؟ ئێوە نەتاندەتوانی وناشتوانن دارەکانی

بڕوێنن ئەگەر خوا بارانی نەباراندبایە، ئایا پەرستراوێکی تری جگە لە خوا هەیە ئەم کارەی لەگەڵ خوادا کردوە، تا لەگەڵ خوادا بپەرەسترێ وبکرێتە شەریکی؟ بەڵکو ئەو موشریك وبێباوەڕانە لە ڕێکای هەق وئیمان لادەدەن وغەیرە خوا وەك خوا لێدەکەن * ئەی ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە باشترن یا ئەو خوایەی کە زەوی کردوە بە مایەی ئۆقرەیی ولە ناوەڕاستیشیدا ڕوباری داناوە، وکۆمەڵێك شاخی بۆ داناوە تا ڕاگیری بکەن وتۆکمەی بکەن، ولە نێوان دوو دەریای سازگار وسوێردا بەربەستێکی داناوە تا تێکەڵ نەبن، ئایا پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا ئەمانەی کردوە تا بپەرەسترێ وبکرێتە شەریکی خوا؟! بەڵکو زۆرێك لەو موشریکانە قەدری گەورەیی خوا ناگرن ونازانن * ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە باشترن یا ئەو خوایەی بە هانای تەنگانەوە دێت کە داوای فریاد ڕەسی لێبکات، وئەو ناڕەحەتیەی سەری لادەدات، ودەتانکات بە جێنشینی یەکتر، ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا ئەم نیعمەتانەتان پێدەخشێت، بەڕاستی کەمێکن بیردەکەنەوە وپەند وەردەگرن * ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە باشترن یا ئەوەی لە تاریکیەکانی دەریا و وشکانیدا ڕێنماییتان دەکات،

ئەی کێیە کە با دەنێرێت بە موژدەدەر پێش دابەزاندنی ڕەحمەتی خۆی کە زەوی پێ زیندو دەکاتەوە؟! ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا ئەم شتانەتان بۆ دەکات؟! پاکی بۆ خوا لەو شیرکانەی ئێوە * پرسیاریشیان لێبکە: ئەی کێیە خەڵك دروستدەکات وهەرکاتیش ویستی لێبێ دەیانمرێت وزیندوشیان دەکاتەوە؟! ئەی کێیە لە ئاسمانەوە ڕۆزیتان دەدات بە دابەزاندنی باران، لە زەویشدا بە سەوزکردنی کشتوکاڵ وهتد..؟! ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا ئەم شتانەتان بۆ دەکات؟! کوا بێنن بەڵگەکانتان ئەگەر ڕاست دەکەن خوا شەریکی هەیە!؟»

## گوزەرێك بەناو میوەکاندا

تەماشای میوەکان بکەن، هەموی هەر میوەیە، کەچی هەریەکە وتامی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەمیان مزرە وئەویان ترش، ئەمیان زۆر شیرینە وئەویان کەم.

## پرتەقاڵ

ئەمە پرتەقاڵە، ئەمە سندیە ، ئەمە نارنجە، ئەمە لیمۆیە... هەموشیان یەك نەوع ویەك جۆرن بەڵام تامەکەیان جیاوازە،

وڕەنگیان جیاوازە، ئەمە بەڵگە نیە کە خوایەك هەیە، ویستی هەیە، دروستکەرە، تاك وتەنهایە، وبێهاوەڵ وبێشەریك وبێڕەفیقە.

## تریٚ:

سەرنجی تریٚ دەدەی، هەیە دانە درێژە، هەیە دانە کورتە، هەشە دانە خڕە، هەیە گەورەیە، هەشە بچوکە، هەیانە ڕەنگی ڕەشە، هەشیانە ڕەنگی سورە، هەیانە ڕەنگی سەوزە، هەشیانە لەو بەینە، هەیانە تامی شیرینە، هەیانە تامی مزرە، هەشتیانە تامی ترشە، ئەمانە بەڵگەی بوونی خوا نیە؟!

## خورما:

سەیری خورما دەکەی کە دەیەها جۆری خورما هەیە، وهەریەکە وتامێکی تایبەت بەخۆی هەیە، وهەموشی هەر ناوی خورمایە.

ئەمانە خوا نەبیٚ -تبارك وتعالی- کیٚ وای لێکردن؟!

بەڕاستی ئەم گەردونە کتێبێکی کراوەیەی خوایە، بە هەمو زمانێك دەخوێندرێتەوە، هەمو کەسێك لێی تێدەگات -گەر وردبێتەوە-.

يَا عَجَبًا كَيْفَ يُعْصَى الإِلَهُ * أَمْ كَيْفَ يَجْحَدُهُ جَاحِدُ؟
وَلِلَّهِ فِي كُلِّ تَحْرِيكَةٍ * وَتَسْكِينَةٍ أَبَدًا شَاهِدُ
وفِي كُلِّ شَيْءٍ لَهُ آيَةٌ * تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ وَاحِدُ

سەیرە چۆن سەرپێچی خوا ئەکرێ
یا چۆن نکوڵی لە بوونی ئەکرێ
لە کاتێکدا لە هەر جوڵە ووەستانێك
ئەبینیتەوە بەڵگە وشاهیدێ
بەڵکو لە هەمو شتێکدا نیشانە هەیە
لەسەر تاك وتەنهایی خودێ

## بڕوا بوون بە زانست دژی ئیمان نیە، بەڵکو زانست بانگت دەکا بۆ ئیمان

ئەو پێشکەوتنەی زاستی ئەمڕۆ، زۆر نیشانەی خوایی بۆ ڕونکردینەوە، وئیمانمانی پتەوتر کرد والحمد لله تعالی.

بەڵگەکانی قسەکەشمان زۆرن، بەڵام نمونەیەکی ئاشکرا دەهێنمەوە:

ئەگەر ئیسلام وئیمان بەخوا، دژی زانست بوایە، ئەوا ئەبوایە ئایەت وفەرمودە ڕاستەکان هەموی بکەوتایەتە درۆوە، هەروەها ئەبوایە ئیسلام لە پاشەکشە وکەمبونەوە ببوایە، بەڵام بە پێچەوانەوە سەرنج دەدەین ئیسلام لە هەر سەردەمێکی تر زیاتر، لەم سەردەمی ئینتەرنێت وچونە سەر مانگ! ونەوەوی وئەو هەمو پێشڕەفتەی بوارە جیاجیاکان دەبینی ئیسلام لە لیستی ئەو ئاینانەن زۆرترینن لە بڵاوبونەوە، سەر لیستەکەی گرتوە وڕەقەم یەکە! ئەو هەمو بیانیە لە مۆسیقار وگۆرانیبێژ وئەکتەر ووەرزشوان وسیاسی -تەنانەت تا ئاستە هەستیار وباڵاکانیش- وزاناکان وپرۆفیسۆر ومامۆستای زانکۆ وخەڵکی سادەکان کە موسڵمان دەبن لە سەرچاوە فەرمیەکانەوە دەبینرێن، بەڵگەی زۆر بەهێز نیە کە ئیسلام لەسەردەمی زانستدا سەری زیاتر بەرزەوە کرد تا ئاستی هەورەکان -وەك لە دوێنێ-، دەنگی زیاتر بەرزەوە کرد -لە چاو ئەوسا-، تەحەدداکەی توندترەوەکرد ونەپسا.

بۆ؟ چونکە دژی زانست نەبو تا بترسیٚ، ترسی لە پێشکەوتن نەبو تا بحەپەسیٚ، قەدی عەقڵی باریك نەبو تا بپەسیٚ، باڵای تەحەددای نزم نەبوو تا بە ئەرزا بچەسپیٚ.

بەڵکو کە تەماشای زانستی ئەمڕۆیان کرد، گەورەیی زانستی خوایان زیاتر بۆ ڕون بوویەوە، ئەوان دەخوێننەوە کە خوا ﷻ ئەفەرمویٚ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ [الإسراء:٨٥]، ((زانستێکی کەمتان پێبەخشراوە))، ئەم پێشکەوتنە زۆرەش دەبینن، ئەوسا دەزانن زانستی خوا چەند گەورەیە کە ئەمە هێشتا کەمە زۆر شتی زانست مرۆڤ پەی پێنەبردوە.

هەروەها گەورەیی دەسەڵات وسیفەتی وێنەگرتنی خوایان لا زیاتر ڕون بویەوە، بینیان دوای ئەو پێشکەوتنە هێشتا زانستی ئەمڕۆ ناتوانیٚ دەنکە گەنمێك، گرامێك گۆشت دروست بکات. وتیان: پاکی بۆ تۆ خوایەکان ئەو ملیارەها دەنکە گەنمە لە چەند سەعاتێکدا لەو خاکە وشکە دەڕوێنێت ودروست دەکەیت!!

هەروەها جوانی کارەکانی خوایان بۆ دەرکەوت، کە بینیان زانستی ئەمڕۆ مرۆڤی ئالی ((ڕۆبۆت)) دروست دەکات،

هەندێکیان پێکەنینێکی هێمانە گرتنی و وتیان: پاکی بۆ تۆ خوایە گیان ئێمە چۆن ڕێدەکەین وئەو چۆن ڕێدەکات؟ ئێمە چۆن دەست دەوەشێنین وئەو چۆن دەیوەشێنێت وهتد...؟ گەرچی پێشماوانە ئەویش هەر لە ئاساری زانستی مەزنیتانە خوایە گیان، تۆ فێری مرۆڤت کردوە وبە ئیزنی تۆ بووە!!

هەر بە ئاسنەکەی خوا ڕۆبۆت دروست دەکات، مرۆڤ توانیویەتی چی لە نەبوون بهێنێتە بوون؟

لە پلەی زانست کەم ناکەمەوە، بەڵکو باسی گەورەیی وگرنگی دروستکراوەکانی خوای بەرز ومەزن دەکەم، ئاخر وایە: کە خۆر هەڵدێت پرشی ڕۆشناییەکەی، ڕوناکی ئەستێرەکان دەبات، کە خۆر هەڵدێت لە شەرما مانگ خۆی دەشارێتەوە.

بەڵێ، زانستی مرۆڤ بە کوێی زانستی خوا ﷻ گەیشتوە، ئەوەتانێ ئەو گەردونە گەورە وبەر فراوانە، زانایانی ناسا دەڵێن: سەرمان سوڕماوە، ئەوەی ئاشکرامان کردوە لەم گەردونە، وەك دلۆپێك وایە لە بەحرێکدا.

بەم نیشانانەی باسمان کرد خوا -سبحانە- لە قورئاندا بانگمان دەکات وخۆیمان پێدەناسێنێ، بۆ ئەوەی بیپەرەستین

وئەفەرمێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَـٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾ [الأنبياء:٣٠-٣٣]،

واتە: «ئایا ئەو بێباوەڕانە نازانن کە ئاسمان وزەوی پێکەوە لکابوون وهیچ لە نێوانیان نەبو، نە باران ونە ڕوەك هەبو، ئەوەبو لە دەسەڵاتی خۆمان لێکمان جودا کردنەوە، وبارانمان باراند وگیامان ڕواند، بە ئاویش هەمو شتێکمان زیندو ڕاگرتوە، ئایا دوای بینینی ئەو هەمو نیشانانە هەر باوەڕ ناهێنن، ولە زەویشدا شاخمان داناوە تا زەوی بچەسپێنێت، وڕێگا ودۆڵی فراوانیشمان لە نێوانیان داناوە بۆ کارئاسانی وشارەزایی خەڵك بۆ بژێویان، وئاسمانمان کردوە بە سەقفێکی بێ کۆڵەکە، وپارێزراوە وبەرنابێتەوە، شەیتانەکانیش پێیدا تێپەڕ نابن، بەڵام بێباوەڕان لە ئاست نیشانەکانی ئاسمان لە بێئاگاییدان، وخوا هەر خۆی شەوی دروستکردوە بۆ حەوانەوەی خەڵك وڕۆژیشی دروستکردوە بۆ بژێوی خەڵك، خۆریشی کردوە بە نیشانەی ڕۆژ، ومانگیشی

کردۆتە نیشانەی شەو، وهەریەکەیان لە تەوەر وفەلەکی دیاریکراوی خۆیدا دەڕوا ولێی لانادات)).

بەڕاستی ئەگەر کەسێك بیەوێت قوڵ ببێتەوە ونیشانەکانی خوا ﷻ ببینێت لە گەردوندا، لە ئاسماندا لە زەویدا، لە شاخەکاندا، لە دار ودەریاکاندا، شتی سەیر وسەمەرە دەبینێت، زۆر نیشانەی گەورە دەبینێت، بەڵام باشترین ووتە ئەوەیە کەم بێت ومەبەست بپێکێت ((خیر الکلام ما قل ودل))، بۆیە ئەمە گوزەرێك بوو بە زەوی وئاسمانەکاندا، بۆ ئەوەی هەندێك لە نیشانەکانی گەورەیی خودا ببینین.

بە کورتی: دەبێت موسڵمان بیروباوەڕی وابێت: هەر خوا خۆی دروستکار هەمو شتێکە لەم گەردونە، هەر خۆشی بەڕێوبەری کاروباری ئەم گەردونەیە، هەر خۆی خاوەنی هەموو ئەم گەردونە پان وبەرین وفراوانەیە، ئەمانەش بەدی نایەت بەبێ بڕوا بوون بە بەبونی خوا -جل جلالە-.

**سێیەم: عەقڵ** ((دلالة العقل)).

هەروەها مرۆڤ بە عەقڵی دەزانێت کە خوا هەیە، ئەوەش دەلالەتێکە لەسەر بوونی خوا، ئەگەر مرۆڤ سەیری خۆی بکات

دەزانێت خوایەك هەیە تاك وتەنهایە، ئەوەتا پەرستراوی هەق قسەیان لەگەڵ دەكات دەفەرموێت: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴾ [الطور:٣٥]، واتە: «ئایا ئێوە هەر لە خۆوە دروستبوون، لە هیچەوە دروست بوون، یان خۆتان دروستكەری خۆتانن؟!» پرسیارێكە بۆ ئینكاری ئەوەیان پێدەڵێت، یانی: خۆتان باشدەزانن دروستكەری خۆتان نین، وناشكرێ هەر لە خۆوە بووبێتن، چونكە مەخلوق بێ خالق نابێ، كەواتە هەر خوا دروستی كردون، ئیتر بۆ ملنادەن؟!

## جا سێ ئەگەر هەیە:

**لە ئایەتەكەوە ڕون دەبێتەوە، سێ گریمانە هەیە:**

**یەكەم:** یان ئەوەتا بوەنەوەرەكان، هەر لە خۆوە دروست بووبێتن وبەدی هاتبێتن بەبێ ئەوەی هیچ بەدیهێنەرێك بەدیهێنابێ وهیچ دروستكەرێك دروستی كردبێت؟

**دووەم ئەوەیە:** بوەنەوەرەكان، خۆیان دروستكەر وبەدیهێنەری خۆیان بن؟

**سێیەم ئەوەیە:** دروستکەر وبەدیهێنەرێکی هەبێت، ئەویش خوایە ﷻ؟

## ئایا مرۆڤ لە خۆوە بووە؟

**بێینە سەر گریمانەی یەکەم:** بوەنەوەرەکان، بە سودفە وهەر لە خۆوە دروست بووبێ وبەدیهاتبێ بەبێ ئەوەی هیچ بەدیهێنەرێك بەدیهێنابێ:

بێگومان ئەم گریمانە شتێکی مەحاڵە ومومکین نیە، چونکە هەمو عاقڵێك دەزانێت: ناکرێ هیچ بەدیهێنراوێك بەبێ بەدیهێنەر بەدی بێت، هیچ دروستکراوێك لە خۆوە وبەبێ خالق بەدی هاتبێت. ئەم بۆچونەش لە شێتیەوە نزیکترە تا ژیری، چونکە «موجود» بەبێ «موجِد» نابێت، «حادث» بەبێ «محدِث» نابێت.

بەڵکو شوانەکانیش ئەمە دەزانن: «البعرة تدل على البعير، والأثر يدل على المسير، فسماء ذات أبراج، وأرض ذات فجاج، ألا تدل على العليم الخبير»، «پشقل بەڵگەیە لەسەر بونی مەڕ وبزن، شوێنپێ بەڵگەیە لەسەر بونی ڕێکردن، جا ئاسمانێکی خاوەن ئەم

هەمو بورجە، وزەویەکی خاوەن ئەم هەمو ڕێگا ودۆڵ وشیوە، هەمو ئەمانە بەڵگە نین لەسەر بونی خودای زانای کاربەجیٚ؟!)).

مولحیدەکان ئەڵێن: بە سودفە بووە، بۆن مونە: ئەگەر شەش مەیمون بلیۆنان ساڵ لەسەر ئامێرێکی نوسین دابنیشن وبدەن لە پیتەکان، لەوانەیە سودفە بکات، لە کۆتاییدا یەکێك لە پەخشانەکانی شکسپیریان نوسیبێتەوە، کەواتە ئەشکریٚ ئەم کەونە موحکەمەش! بە هۆی کۆمەڵە کردارێکی نادریارەوە پێش بلیۆنان ساڵ بە سودفە دروست بوبیٚ)) [1].

لە وەڵامی ئەمەدا، کریستی موریسون سەرۆکی ئەکادیمیای زانستی لە نیویۆرك وئەندامی پێشوی ئەنجومەنی جێبەجێکار، لە ئەنجومەنی لێکۆڵینەوەی نەتەوەیی ئەمریکا، ئەڵیٚ: ئەگەر دە دیناری ئاسن -با من نمونەی دینار بهێنمەوە- بهێنیت ولە ژمارە یەك بۆ دەی لەسەر بنوسی، پاشان بیخەیتە گیرفانتەوە وبەجوانی تێکی بدەیت، پاشان هەوڵی ئەوە بدەیت یەکەمجار ژمارە یەك بێتە دەستت، ئیحتمالی دە جار هەوڵدان هەیە بۆ ئەوەی یەکەمجار

---

■ تەماشا بکەن شەیتان چۆن ئەیەویٚ هەر چۆنێك بووە بەرەو دۆزەخیان بیانبات.

ژماره یەك بێته دەستت، بەڵام بۆ ئەوەی به تەرتیب له یەکەوه بۆ دە، بێته دەستت، ئەوه لەوانەیه دوای دە بلیۆن جار ڕو بدات».

باشه ئەمه بۆ ژماره یەك بۆ دە، ئەی ئەم گەردونه بەم فراوانی وجوانی وڕێکی وتۆکمەییه، پێویستی به چەند ساڵ هەیه، بەڕاستی ئیحتماڵێکی خەیاڵی دەردەچێت که له ژماردن نایەت، چ جای ئەوەی تەسەور و وێنا بکرێ!

هەروەها گریمان وا دابنێ -که واش نیه- به سودفه دروست بوو بێت، ئەی شتێك به سودفه دروست ببێ، به ڕێك وپێکی «منتظم»ی دروست نابێت، ئەگەر به ڕێکیش دروست بێت، به ڕێکی وجوانی گەشه ناکات، ئەگەر به ڕێکیش گەشه بکات، به ڕێکی وجوانی بەردەوام نابێت، بەڵام که سەیری بونەوەرەکان دەکەین زۆر به ڕێك وپێکی وجوانی دروستکراوه وگەشه دەکات وبەردەوامیشه تا ئەو کاتەی خوا ویستی لێیەتی: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ [التين ٤]، واته: «سوێند بێ له جوانترین شێوه و وێنه مرۆڤمان دروستکردوه»، عاقڵەکانیش شاهیدی لەسەر ئەمه دەدەن.

ئەمە لە ئەسڵی دروستبونیان، هەروەها لە گەش ونما ومانەوە وبەردەوامیشیاندا هەر ڕێك وپێك وجوانن، بۆ نمونە: مرۆڤ زۆر بە ڕێکی وجوانی دروست ئەبیٚ وبە ڕێکیش گەشە ئەکا وبە ڕێکیش بەردەوامە. بەڵکو تا گەورەتر ئەبیٚ ڕێك وپێکتر وبەهێزتر ئەبێت بەڵکو گەیشتە چل ساڵی، ئەگاتە ئەوپەڕی عەقڵ وهێزی.

هەروەها مولحیدەکان ئەڵێن: «سروشت «الطبیعة» دروستی کردوە!!».

لە وەڵامدا ئەڵێین: سەرەتا ئەم شوبهە کۆنە، خودا لە قورئاندا باسی دەکات، کە بێباوەڕان وتویانە: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ [الجاثیة:٢٤] واتە: «ژیان نیە تەنها ئەم ژیانی دونیایە نەبێت، هیچ نامان مرێنێت تێپەڕبونی ڕۆژ وشەو وتەمەن درێژی نەبیٚ». ئەوان وتیان: ڕوداوەکان وئەمانیش وتیان: خودی شتەکان!!

پاشان مەبەستتان چیە لە سروشت؟! مەبەستتان خودی شتەکانە، یان ئەو ڕێسا ونیزام ویاسایانە ئەم گەردونە لەسەری دەڕوا؟! یان مەبەستتان هێزێکی تری بەدەر لەم گەردونەیە ئەم گەردونەی بەدیهێناوە ودروستی کردوە؟!

جا ئەگەر وتیان: مەبەستمان خودی گەردونە، واتە: ئاسمان خۆی خۆی دروستکردوە وزەویش هەروەها وهتد..، ئەوا پێویستمان بە قسە وکاتێکی زۆر نیە بۆ وەڵامدانەوە، چونکە پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە هەرگیز هیچ شتێك ناتوانێت خۆی دروست بکا وهەمو ژیرەکان کۆکن لەسەر ئەم خاڵە.

خۆ ئەگەر وتیان: مەبەستمان ئەو ڕێسایەیە کە گەردون لەسەری دەڕوا.

لە وەڵامدا ئەڵێین: ئەمە چەواشەکاری وفێڵکردنە، وەگەرنا منیش دەزانم گەردون لەسە نیزامێك بەڕێوە دەڕوات، بەڵام کێ ئەو نیزامەی داناوە، کێ دروستی کردوە؟ ئەمە بنچینەی پرسەکەیە.

بەڵێ، پێم ئەڵێ ئەوە چیە؟ بەڵام پێم ناڵێ چۆن وکێ وای لێکردوە؟

خۆ ئەگەر بڵێ: مەبەستم لە سروشت، هێزێکی دەرەوەی گەردونە، ئەم گەردونەی بەدیهێناوە، هێزێکی بیسەری بینای کاربەجێی بەتوانای...هتد، ئەوا ئەڵێین: ڕاست دەکەیت وئەمە

تەواوە، بەڵام هەڵەتان کرد ناوتان لێنا: سروشت، بەڵکو ئەوە ناوی: الله یە -جل جلالە-.

جا لەم ماوە زانایانی شوێنەوار، شارێکی خاپوریان دۆزیەوە لە ژێر خاکدا، کەس هات بە بیریدا لە زانایان یا لە خەڵك، بڵێ: ئەمە هەر لە خۆوە دروست بووە، بەهۆی با وباران وتەپ وتۆزە وسەردی وگەرمیەوە؟!!

ئەی کەسێك وا بڵێت؟ بێگومان دایك وبابی دەیبەن بۆ لای پزیشکی دەرونی! وئەڵێن: ڕۆڵەکەمان تێکچوە!

ئەمەش پێی ئەوترێ: ((قانون السببية)).

جا مرۆڤەکان هەوڵی زۆریاندا کە هەمو قۆناغەکانی هۆکارەکان بژمێرن قۆناغ بە قۆناغ، وئەو زنجیرانە بدۆزنەوە تا دەگاتە سەرەتای دروستبونی جیهان، ئەزمونی زۆر خرا ڕوو، هەوڵی زۆر درا، بەڵام بێئومێد بوون ولەو شوێنە وەستان کە غەیب دەست پێدەکات، کە زانا ونەزان تێیدا یەکسانە.

لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتوە: خەڵکانێك ویستویانە گفتوگۆ بکەن لەگەڵ پێشەوا ئەبو حەنیفەدا لەمەڕ پەروەردگار، ئەویش - بە ڕەحمەت بێ- پێی وتون: ((-پێش قسەکردنمان لەمەڕ ئەم

بابەتە- هەواڵم بدەنێ لەبارەی کەشتییەکەوە لە ڕوباری دیجلە، دەڕوات خۆی پڕ دەکات لە خۆراك وشتەکانی تریش، هەر بەخۆیشی دەگەڕێتەوە، ولەنگەر دەگرێت خۆی بەتاڵ دەکا ودەشگەڕێتەوە، هەمو ئەمانە بێئەوەی کەس سەرپەرشتی بکات؟!».

وتیان: «شتی وا مەحاڵە وهەرگیز نابێ».

ئەویش وتی: «ئەگەر ئەمە مەحاڵ بێت بۆ کەشتیەك، ئەی چ جای ئەم هەمو گەردونە فراوانە، بە ئاسمان وزەویەوە؟!» چۆن ئەکرێ هەر لە خۆوە بڕواتە ڕێوە بەبێ بەڕێوەبەرێك.

تەنانەت هەبووە لە ناو عەرەبەکانی کۆندا هەر بە عەقڵی خۆی زانیویەتی کە خوا هەیە، لەوانە:

قیسسی کوڕی ساعیدەی ئیادی لێوەی دەگێڕنەوە وتویەتی:

«أَيُّهَا النَّاسُ اسْمَعُوا وَعُوا، مَنْ عَاشَ مَاتَ، وَمَنْ مَاتَ فَاتَ، وَكُلُّ مَا هُوَ آتٍ آتٍ، لَيْلٌ دَاجٍ، وَسَمَاءٌ ذَاتُ أَبْرَاجٍ، بِحَارٌ تَزْخَرُ، وَنُجُومٌ تُزْهِرُ، وَضَوْءٌ وَظَلَامٌ، وَبِرٌّ وَآثَامٌ، وَمَطْعَمٌ وَمَشْرَبٌ ، وَمَلْبَسٌ وَمَرْكَبٌ. مَا لِي أَرَى النَّاسَ يَذْهَبُونَ، وَلا يَرْجِعُونَ، أَرَضُوا بِالْمَقَامِ، فَأَقَامُوا، أَمْ تُرِكُوا فَنَامُوا».

واته: «ئەی خەڵکینە ببیستن وتێبگەن، هەرکەس بژی دەمری، وئەوەشی بمرێ دەڕوا، وئەوەی کە بڕیارە بێت هەر دێت ئەمڕۆ یا سبەی، شەوی تاریك، ئاسمانی خاوەن بورج، دەریای پڕ، ئەستێرەی درەوشاوە، ڕوناکی وتاریکی، چاکی وخراپی، خواردن وخواردنەوە، جلوبەرگ وسوار، ئەوە چیە خەڵك ئەبینم دەڕۆن، وناگەڕێنەوە؟! ئایا ڕازین بە شوێنەکەیان بۆیە ماونەتەوە!؟ یان وازیان لێهێڵراوە بۆیە بۆ خۆیان خەوتون؟!»

جا بەڵێ بێگومان مرۆڤ بە عەقڵی بڕوانێت، ئەوسا خوا ﷻ دەبینێتەوە ودەیناسێ.

## ئایا مرۆڤ خۆی دروستکەری خۆیەتی؟

**گریمانەی دووەم:** خۆیان دروستکەری خۆیان بن، ئەمەش دیسانەوە مەحاڵە ومومکین نیە، چونکە بونەوەرەکان پێش ئەوەی بەدیهاتبێتن هیچ «العدم» بوون، و«هیچ» یش، شت دروست ناکات، «العدم» مەوجود دروست ناکات. هەر کەسێك تۆزێ عەقڵی هەبێ ئەوا ئەزانێ شتی وا نابێ، وباوەڕ بون بەمە

له شێتیەوە نزیکترە تا ژیری، چونکە هەرگیز ناکرێ هیچ کە هیچە ونیە، خۆی بەدی بهێنێ وخۆی دروست بکا!!

یانی بیهێنە پێش چاوی خۆت: تەلەفزیۆنەکەی ماڵتان پێش ئەوەی دروست بکرێ، چی بووە؟ هیچ. ئەی باشە ئەگەر هیچ بووە، چۆن هاتوە خۆی دروستکردوە؟!

کەوابو تەنها بەشی سێیەم مایەوە، ئەویش:

## هەر «اللّٰە» مرۆڤی دروستکردوە

سێیەم ئەوەیە: ئەم بونەوەرانە خالق وبەدیهێنەرێك بەدیهێناون، ئەویش «اللّٰە»یە ﷻ، کە بەدیهێنەری هەمو شتێکە، دروستکەری هەمو دروستکراوێکە، کاروباری ئەم گەردونە بەڕێوە ئەبات.

جا دروستکراو دروستکەرێکی هەیە، موجود موجیدێکی هەیە، ئەسەر موئەسیرێکی هەیە، موحدەس موحدیسێکی هەیە، مەصنوع صانعێکی هەیە، مەفعول فاعلێکی هەیە.

ئەمانە کۆمەڵێك پرسی بەڵگە نەویستن، وهەمو عاقڵەکان کۆکن لەسەری، جا هەرکەس بەڵگە بهێنێتەوە بۆ پوچکردنەوەی

ئەم بناغەیە، ئەوا بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر نوقسانی عەقڵی وسەرلێشێواوی خۆی.

بۆیە جویەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەفەرموێت: یەکەم ئایەتێك بەر گوێم کەوتبێت ئەم ئایەتە بوو، کە پەیامبەری خوام بینی ﷺ لە نوێژی مەغریبدا دەیخوێند: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۣيْطِرُونَ ﴾ [الطور:٣٥-٣٧]، دەڵێت: «سوێند بەخوا وەختبوو دڵم بفڕێ» رواه البخاري.

بۆچی دڵی وەختبو بفڕێ؟ بێگومان بەهۆی جوان تێگەیشتنی لە ئایەتەکە، وئەو بەڵگانەی کە تێیدایە.

بۆیە مرۆڤ بە عەقڵی دەزانێت خوایەك هەیە تاك وتەنهایە.

**چوارەم: شەرعەکانی خوا «شرائع الله ﷻ».**

هەمو کتێبە ئاسمانیەکان ئەمە دوپات دەکەنەوە، کە خوا بەدیهێنەری ئەم گەردونەیە.

هەروەها هەمو ئەحکامە دادگەریەکانی شەرعەکان، پڕا وپڕ لە بەرژەوەندی بەندەکاندایە.

ئەحكامەكانی لەوپەڕی پتەوەیی وتۆكمەییدایە، كە مرۆڤەكان ناتوانن ئەحكامێكی هاوشێوەی شەرعەكانی خوا بهێنن، هەربۆیە زۆرێكی یان زۆربەی یاسا وڕێسا ودەستورەكان كە دایدەڕێژن، هەڵهێنجان لە شەرعەكانەوە دەكەن دەستكاری دەكەن.

هەر بۆیە تا ئێستا نەیانتوانیوە بە داهێنانی فیكری خۆیان، بەدەر لە شەرعەكانی خوا -جل جلالە- بە تەواوەتی یاساياكانيان دابنێن.

جا بوونی ئەم شەریعەتە پاكە، لەگەڵ ئەو هەموو ئەحكامە تۆكمە وجوانانە كە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەكانە، بەڵگەیە خوایەك هەیە بەرژەوەندی مرۆڤ دەزانێت دانا وزانایە، زانایە بەوەی چی بەرژەوەندی بەندەكانی تێدایە؟

هەروەها لەشەرعەكاندا چەندین جار باسی قیامەت دەكرێت، باسی داهاتو وئاینده دەكرێت، باسی كۆمەڵێك ئەقداری كەونی دەكات، هەموی وەكو ئەوەی هەواڵدراوە وباسكراوە بەدی دێت، كەواتە: خوایەك هەیە خاوەن پەیمانی خۆیەتی وبەدەسەڵاتە بەوەی

که بەڵێنێك بدات جێبەجێی دەکات، ئەمەش بەدەلالەتی شەرع وهەست زانیمان.

پاشان زۆربەی خەڵکی سەر زەوی ئەمڕۆ، پیادەی یان ئاینی ئیسلام یان گاور یان جولەکە دەکەن، هەر سێ ئەم ئاینەش لەسەر بوونی خوا کۆکن، بەڵکو هەرچی ئاین هەیە لەسەر زەوی دا بڕوای بەخوا هەیە هەر یەکە وبە سیفەتێك، واتە بڕوا نەبون بەخوا دەرچونە لە هەمو یاسا وڕێساکان.

**پێنجەم: هەست «دلالة الحس».**

پاشان بە دەلالەتی هەستمان زانیمان، ئەمەش لە دوو ڕوانگەوە:

**١. چەندێکمان بیستمان وبینیمان کە خوا ﷻ چۆن دوعای خەڵك وەڵام دەداتەوە،** پاڕانەوەکان گیرا دەکات، بە تەنگی کروزانەوەی ئەوانەوە دەڕوات کە لە تەنگانەدان، بە دەم نزای هاوارکەرانەوە دەڕوات، چەند بێکەس خوا بوو، خوا چو بە هانایەوە؟! چەند تەنیا ودڵتەنگ خوا بو بە ئەنیس ودڵنەوای؟ زۆرمان بینی وبیست! کە ئەمە بەڵگەیە لە سەر بوونی ﷲ.

ئێمه هاوڕێمان هەبو، دوعای بکردایه یەکسەر گیرا دەبوو، بەو چاوانەی خۆمان بینیومانە دوعای گیرا بووه، چەندین جار! باوەڕ نەکەین؟ بڕوا نەکردن بە چاوی خۆت نە جارێك ونە دوو ونە سیّ، شێتیه!!

خوای گەورە باسی نوح دەکات وئەفەرموێ: ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ [الأنبياء:٧٦]. واتە: «کە نوح پاڕایەوە، وەڵامان دایەوە ولە ناڕەحەتی دەرمانکرد».

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ [الأنفال:٩]. واتە: «کە لە شەڕەکەدا پاڕانەوە داوای فریاد ڕەسیتان کرد لەو تەنگانە، ئەوەبو وەڵامی دانەوە وفریشتەی نارده یارمەتیتان».

هەروەها ئەنەس ئەفەرموێ: «أَصَابَتْ النَّاسَ سَنَةٌ [في رواية:قحط] على عهد النَّبِيِّ ﷺ، فَبَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ [ر:على المنبر] [ر:قائما] في يوم جُمُعَةٍ، قَامَ أَعْرَابِيٌّ [ر:دخل] [ر:من أهل البدو] [ر:من باب كان وجاه المنبر] [ر:نحو دار القضاء ورسول الله قائما]، فَقَالَ: يا رسول الله هَلَكَ الْمَالُ وَجَاعَ الْعِيَالُ؛ فَادْعُ اللَّهَ لَنَا

[ر:أن يسقينا]، فَرَفَعَ يَدَيْهِ [ر:حتى رأيت بياض إبطيه]: [ر:اللهم أغثنا، اللهم أغثنا، اللهم أغثنا] [ر:ورفع الناس أيديهم معه يدعون]، وَ[لا والله] مَا نَرَى فِي السَّمَاءِ [ر:من سحاب ولا] قَزَعَةً [ر:ولا شيئًا]، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا وَضَعَهَا حَتَّى ثَارَ السَّحَابُ أَمْثَالَ الْجِبَالِ، ثُمَّ لَمْ يَنْزِلْ عَنْ مِنْبَرِهِ حَتَّى رَأَيْتُ الْمَطَرَ يَتَحَادَرُ عَلَى لِحْيَتِهِ ﷺ، فَمُطِرْنَا يَوْمَنَا ذَلِكَ وَمِنْ الْغَدِ وَبَعْدَ الْغَدِ وَالَّذِي يَلِيهِ حَتَّى الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى، وَقَامَ ذَلِكَ الْأَعْرَابِيُّ أَوْ قَالَ غَيْرُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ تَهَدَّمَ الْبِنَاءُ وَغَرِقَ الْمَالُ، فَادْعُ اللَّهَ لَنَا. فَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا، فَمَا يُشِيرُ بِيَدِهِ إِلَى نَاحِيَةٍ مِنْ السَّحَابِ إِلَّا انْفَرَجَتْ، وَصَارَتْ الْمَدِينَةُ مِثْلَ الْجَوْبَةِ، [يريهم الله كرامة نبيه وإجابة دعوته] وَسَالَ الْوَادِي قَنَاةُ شَهْرًا وَلَمْ يَجِئْ أَحَدٌ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَّا حَدَّثَ بِالْجَوْدِ».

واتە: «پەیامبەر ﷺ لەسەر مینبەردا وتاری ئەفەرمو: کابرایەکی دەشتەکی هاتە مزگەوتەوە، وتی: یا رسول الله ماڵ ومولڵك وئاژەڵان تیاچون، ومنداڵان برسیانە، دوعا بکە بارانی ڕەحمەت ببارێت، پەیامبەریش ﷺ دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە تا سپیایی بن باڵی دەرکەوت، دەڵێت: سوێند بەخوا پەڵە هەورێکیش بە ئاسمانەوە نەبو، سوێند بەوەی نەفسی منە بە

دەستە، دەستەکانی دانەگرت تا هەورەکان وەك شاخەکان هاتن، ولە مینبەر دانەبەزی تا ئاوی بارانمان بینی ڕیشی موبارەکی تەڕکردبوو وپێیدا دەهاتە خوارەوە، ئیتر کە گەڕاینەوە ماڵ ناو شاری مەدینە هەموی گۆمە ئاوی باران بوو، هەفتەی داهاتو ئەو پیاوە یا جگە لەو بوو هاتەوە وداوای وەستانی بارانەکەی کرد ودیسانەوە دەپاڕێتەوە وبارانەکە دەوەستێت .. هتد[1]، ئەمانە هەموی بەڵگە نیە کە خوایەك هەیە، وەڵامی داوای داواکەران دەداتەوە؟!

**٢. هەرکەس تەماشای خۆی بکا**، بە هەستی هەست بەوە دەکات کە لە خۆوە نەبوە وخالقێك خولقاندویەتی، بە تایبەت زانستی ئەمڕۆ لەم بارەوە شۆڕشێکی گەورەی بەرپاکرد لە دژی بێباوەڕان، کە هیچ بواری نەهێشتەوە بۆ وتەی: لە خۆوە دروستبووە، یان بە سودفە دروست بووە!

خوای کاربەجێ ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ﴾ [الأعراف:١١]. واتە: ((ئیمە ئێوەمان دروست کردوە پاشان وێنەتانمان

---

[1] متفق عليه صحيح البخاري، كتاب الاستسقاء، باب من تمطر في المطر حتى يتحادر على لحيته، رقم (٩١٨)

کێشاوە))، هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ [غافر:٦٤]. واتە: ((الله ئەو خودایەیە کە زەوی بۆ داناون، تا تێیدا بە تۆقرەیی بمێننەوە، وئاسمانیشی کردوە بە سەقف بۆ زەوی، وئێوەشی دروستکردوە لە باشترین وێنە وجوانترین شێوازدا، وجۆرەها نازونیعمەتی پاك وحەڵاڵی پێبەخشیون، ئەوەی ئەو نیعمەتانەی بەخشیوە پەروەردگارەکەتانە، هەر زۆر بێ خێر وچاکە وفەزڵ وفەڕی، وپاکی بۆ خوا لەوەی بۆ ئەو ناشێ)).

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ [التغابن:٣]. واتە: ((ئاسمان وزوەی دروستکردوە بە هەق، بە ئەوپەڕی داناییەوە، وئێوەشی بە جوانترین شێواز دروستکردوە، ولە قیامەتیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە بۆ پاداشتی کارەنتان)).

**٣. ڕێنماییکردنی دروستکراوەکانی،** کە لەوەو پێش لەم بارەوە هەندێکمان باسکرد. جا بە هەستمان لەو کارانە بڕوانین، ڕون دەبێتەوە کە خالقێکی هەیە کە خوایە ﷻ.

**٤. فره جۆری وفره ڕەنگی وفره تامی وفره چەشنی میوەکان،** هەروەها بوونی ئەو هەمو ڕەنگە جوان وسەرنج ڕاکێشە، وەك پێشتر باسمان کرد.

**٥. جیاوازی زوبانەکان:** هەروەها جیاوازی زوبانەکان ئەو هەموو زمانەی دروستکردوە، خوایەك لەو هەموو زوبانە تێدەگا، وەلاَمی داخوازی ئەو هەموو زوبانە دەداتەوە بەلَگە نیە کە خوایەك هەیە تاك وتەنهایە بێشەریك وبێهاوەلَە؟! بێگومان.

[خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّلْعَـٰلِمِينَ ﴾ [الروم:٢٢] واتە: «لە نیشانە وبەلَگەکانی دەسەلاَتی خوا تبارك وتعالی، دروستکردنی ئاسمانەکان وبەرزکردنەوە وڕاگرتنیەتی بەبێ کۆلَەکە، ودروستکردنی زەویە بەو پانی وفراوانیە، وهەر لە نیشانە وبەلَگەکانی دەسەلاَتی خوا جۆراوجۆری زوبانتان وفرە ڕەنگیتانە، بەڕاستی ئا لەمەدا بەلَگەی زۆر گەورە هەیە بۆ هەمو خاوەن زانست وبینابیەك].

**بەلَیٚ،** ئەمانە هەموی بەلَگەی بونی خوان، ئیمان بەخوایەك دەهێنم ئەوانەی دروستکردوە.

## هاتنی پەیامبەران بەڵگەی بونی خوایە

پاشان هاتنی خودی پەیامبەران -سەڵات وسەلامی خوایان لەسەر بێت- بەڵگەی بونی خودان:

چونکە لە فەرموودە لاوازەکاندا[1] هاتوە کە «١٢٤,٠٠٠» سەدو بیست وچوار هەزار پەیامبەر -علیهم الصلاة والسلام- هاتون.

هەمو ئەم پەیامبەرانە موعجیزەیان پێدراوە لەلایەن خواوە ﷻ، بەڵگە ونیشانەی قەتعی ودڵنیاکەرەوەیان پیشاندراوە کە ئەوانە نێردراوی خوان.

بونی ئەو نیشانە وموعجیزانە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا ﷻ تەئید وپشتگیری پەیامبەرانی خۆی دەکات.

## پاداشتدانەوەی چاکەکاران هەر لە دونیا وسزادانی خراپەکاران هەر لە دونیا

ولە بەڵگەکانی بوونی خوا وتەنهاییەکەی، پاداشتدانەوەی چاکەکارانە هەر لە دونیا، وسزادانی خراپەکارانە هەر لە دونیا.

سەرنجی ئەوانە بدەن چاویان ها بە هەژارانەوە وسەردانی خزمانیان دەکەن، ویەهانای لێقەوماوەوە دەڕۆن، چەند خودا لوتفیان لەگەڵ دەکا، چۆن پاداشتیان دەداتەوە هەر لە دونیادا کە خەڵك بە چاوانی خۆیان دەیبینن؟ جێگەیان بۆ پڕدەکاتەوە، ڕۆز ورزقی زیاد دەکا، بەهۆی ئەو چاکانەوە، ئایا ئەمە بەڵگە نیە کە خوایەك هەیە بەسەر هەمو بەندەیەکەوە چاودێرە وکارەکانی دەژمێری پاداشتی دەداتەوە، بەبەڵگەی ئەو پاداشتەی دونیا پاداشتی ئاخیرەتیش هەیە؟! بێگومان عەقڵەکان دوربین ووردبینن. ئەگەر بمەوێ هەمو جۆرەکانی ئەم خاڵە باس بکە ملە ژماردن نایەت! خەڵکیش زۆر وبێشومار وسەیریان بینیوە لەم بارەوە! ﴿وَمَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ [الرعد:٣٩]، واتە: ((هەرچی ببەخشنەوە، بێگومان خودا جێگەیتان بۆ پڕ دەکاتەوە هەر لە دونیادا، ولە قیامەتیشدا پاداشتی گەورەتر دەدرێیتەوە)).

هاوشێوەی ئەمەش: سزادانی ستەمکاران ودەستبڕ وڕێگرەکانە، سزاکانیان هەمو کەسێك دەیبینێت بە چاوی خۆی، ودڵنیان کە ئەوە سزای ئەو ستەمە بوو.

جا هەرکەس لە مێژوو وئێستاش وردبێتەوە، ئەسباب وموسەببات پێکەوە گرێ بدات، بەجوانی بۆی ڕون دەبێتەوە کە خوا هەیە وتاك ونەهایە.

## بە تەنهاکردنەوەی خوا لە کارەکانیدا

کە بڕوامان بەخودا ﷻ هێنا، ئەبێت بڕواشمان بەوە هەبێت کە: هەر خوا دروستکەری گەردونە، هەر خۆی خاوەنی گەردونە وهەموی موڵکی ئەوە، هەر خۆی بەڕێوەبەری کارەکانی گەردونە بە تاك وتەنها، یانی: هەر خوا ژێنەرە، هەر خوا مرێنەر، هەر خوا ڕۆزیبەخشە، هەر خۆی باران دەبارێنێ، هەر خۆی گیا سەوز دەکا ومنداڵ دەبەخشێ، وسود وزیانی بەدەستە.

بە کورتی هەرچی کاری خوایە، تایبەتی بکەی بە خواوە وکەس نەکەی بە هاوبەشی.

کە مرۆڤ ئەم قەناعەت وبیروباوەڕەی لە دڵدا بو، ئەوسا تەقوای ئەبێ ولە خوا ئەترسێ.

ئەمەی باسکرد، زانایان ناوی لێدەنێن: بەتەنها کردنەوی پەروەردگارێتی «توحید الربوبية»، یانی بەتەنها کردنەوەی خوا لە

پەروەردگارێتیدا، پەروەردگارێتیش سێ کوچکەی هەیە: دروستکردن وخاوەندارێتی وبەڕێوەبردن «الخلق والملك والتدبير».

## چەسپاندنی ناو وسیفەتەکانی خوا

هەروەها ئەبێ پێمان وابێ، خوای مەزن خاوەنی هەمو سیفەتێکی کاملّی وتەواوەتیە، هەرچی لە قورئان وفەرمودە سەحیحەکاندا هاتبو، بۆ خوای بچەسپێنین، بەبێ نمونە بۆ هێنانەوە، بەبێ چواندن، بەبێ چۆنێتی پێدان، بەبێ پەکخستن ولابردن ونکولّی لێکردن، بەبێ هەڵگێڕانەوەی، بەبێ لادانی لە واتا دیارەکەی.

کە خوا ﷻ بیسەرە، ودەشبیستێ، بۆیە ئەبێت ئاگامان لەزارمان شتێك خوای پێ توڕە ببێت.

هەروەها پێمان وابێت هەر خوایە بە تەنها دەنگی هەموو کەسێك دەبیستێت، هیچ مەلایەك، هیچ شەخسێك، هیچ قەبرێك، هیچ شێخێك، هیچ کەسیاك، ناتوانێ لە دوعا وداخوازی

ئەو هەمووو خەڵکە تێبگات، ومەرازی ئەو هەمو خەڵکە حاسڵ بکا.

جا ئەگەر پێت وابێت کە شەخسێك یان قەبرێك دەنگی هەموو هاوارێك دەبیستێت؟ تۆ لە کوردستانەوە هاواری بکەیت، بڵێی: یا غەوس هاوار! یەکێکی تر لە پاکستانەوە هاوار بکات، بڵێت: یا غەوس هاوار! ئەوی تر لە ئێرانەوە هاوار بکات، بڵێت: یا غەوس هاوار! گوێشی لە هەموویان دەبێ ووەڵامیشیان دەداتەوە؟! ئاخر ئەوە سیفەتی خوایە بەندە ئەمەی پێناکرێت دار وبەرد وقەبر ئەوەیان پێ ناکرێ.

خوا ﷻ تەنها وتەنهایە، بێ شەریك، بێ ڕەفیق، بێ هاوەڵ، بێ هاوسەرە، تەنیایە لە ناوەکانیا، لە سیفەتەکانیا، لە زاتیا، لە کرداریا، هیچ شتێك وەکو خوا نیە وهەر ئەوە بیسەری بینا، تاکە بێ نیاز، تاکە جێی نیاز، بێ نیاز بە هەموو مەخلوقات، جێی نیازی خەڵك وکەون وکائینات، نە لە کەس بووە ونە کەسی لێ بووە، زانا وئاگادارە بەوەی بووە وبەوەی ئەبێ، بەوەی نەبوە وبەوەشی نابێ، گەر ببوایە چۆن دەبوو، بۆ نەبووە وبۆ نابێ؟ بێسەر ودانا وزانا وکار لەجێ وبەجێ لە بۆ ئەوەی دەشێ ولەو

کاتەی بشێ، بیسەری هەموو دەنگێک، بە هەر ڕەنگێك، بە هەر لوغەتێك، زانا بەوەی پێش ووتن چی دەڵێی بە چی نیەتێك، زانا بە هەموو نهێنیەك، بەوەشی حەشار دراوە لە سنگی هەر کەسێك، بینەری مێرووڵەی ڕەش، لەسەر بەردێکی ڕەش، لە شەوێکی ڕەش، بیسەری خشەی پێی، گەڵایەك لە دارەکەی بەر نابێتەوە مەگەر بە ئیزن وئاگا وزانستی ئەو نەبێ، بەر ئەبێ یا بەر نابێ، شایستەی هەموو سوپاسێك، شوکرێك، سەنایەك، مەدحێك، لەهەر کاتێك، لە هەر بارێك، لەوەی دەشێ وشایستەیە بۆ ئەو.

کەسی واهەبوە منداڵەکەی نەخۆشبوە بردویەتیە لای شێخەکەیان، پێی وتوە: خۆت ئەو منداڵەت پێداوم، خۆشت شیفای بدە!!

یانی پێی وابوە کە ئەو قەبرە، شیفا دەدات، بۆیە پێی وتوە چاکی بکەوە، یان بیبەوە.

بۆیە کە دەڵێین تەوحید «التوحید»، وشەکە واتە: بەتاکگرتن وتەنها کردنەوە، «تفعیل»ە، وەکو «التکفیر» کە یانی: بیکەی بە کافر، جا تەوحیدیش واتە: تەنهای بکەیتەوە، کە وتیشمان

تەوحیدی خوا، واتە: خوا بە تەنها بکەیتەوە لەوەی کە تایبەتە بە خۆیەوە، کەس نەکەی بە شەریکی.

سەیر لەوەدایە، کافرەکانی قورەیشیش باوڕیان بە پەروەردگاریەتی خودا هەبووە -تبارك وتعالی-، پێیان وابوو: خوا دروستکەری ئەوان وئاسمان وزەویە، خاوەنی عەرشە، هەر خۆی پەناهەندەی بەندەکانیەتی، بەڵگەش لەسەر ئەوە، خودی قورئانە پیرۆزەکەمانە:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴾ [المؤمنون:٨٤-٨٩].

واتە: «ئەی موحەممەد ﷺ پرسیار لە کافرەکانی قورەیش بکە، پێیان بڵێ: زەوی وئەوەشی لە ناخیدایە هی کێیە، ئەگەر ئێوە دەزانن؟ کافرەکانیش دەڵێن: هی خوایە! تۆش پێیان بڵێ: ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ باشە، زەویەك هی خوابێت، وئەوەی ناخیشی هەروەها، ئەی ئەگەر ئەو زەویەی ژێر پێتان بلەرزێنێت ولەناوتان

بەرێت؟! ناترسن یەکێکی تر دەپەرستن وهاوار لەیەکێکی تر دەکەن!؟ بۆ بیر ناکەنەوە؟!

پێیان بڵێ: کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانە، -تەماشا دەکەی پێیان وابوە ئاسمانەکان حەوت چینن!-، وکێ پەروەردگاری عەرشی مەزنە؟ ئەوانیش ئەڵێن: هی خوایە! تۆش پێیان بڵێ: ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ ئەی باشە ئەگەر خاوەنی حەوت ئاسمان وعەرشی گەورەیە ناترسن غەزەبتان بەسەردا ببارێنێت، ئەی خۆتان ناپارێزن لەوەی لەسەر عەرشە؟!

ئەی موحەمەد ﷺ پرسیاریان لێبکە، کێ خاوەنی هەموو شتێکە، کێ هەموو شتێکی بەدەستە، کێ خەزێنەی هەمو شتێکی لەدەستدایە؟ وهەر ئەو پەناهەندەیە وپەنای هەموو کەسێك دەدات داوای پەنای لێبکات، وکەسیش نیە پەنا بدات لەخوا، کەس ناتوانێ لەدەستی خوا ڕابکات، گەر دەزانن هەواڵم بدەنێ؟ دەبینی ئەوانیش دەڵێن: هەمووی هی خوایە.

ئەی موحەمەد ﷺ پێیان بڵێ: ﴿فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ﴾ چ سحرێکتان لێکراوە، چۆن سەرتان لێشێواوە، ئەم هەمو باوەڕەتان هەیە کەچی لە پەرستنی خوا لادەدەن وجگە لەخوا دەپەرەستن)).

هەروەها لە سودەکانی تەوحیدی پەروەردگاریەتی، ئازا وچاونەترس بوونە، ئەوسا ئیمانی خۆی ڕادەگەیەنێت، بانگەوازی خۆی دەکات وپەیامی خوا بڵاودەکاتەوە، وترسی لەوەنیە هیچ کەسێك بیکوژێت، چونکە هەر خوا خۆی پەنا هەندەیە، کەسێك خوا پەنای بدات هیچ دەستێك ناتوانێت پێی بگات.

ئەگەر مرۆڤ پێی وابو خوا ڕۆزیبەخشە، ئەوسا ناترسێت ڕۆزیەکەی غەیری خۆی بیخوات.

ئەگەر مرۆڤ بزانێت خوایەك هەیە، ڕەقیبە وچاودێرە بەسەریەوە ودەیبینێت، لەسەر عەرشە وئاگای لێیەتی ودەیبینێت ودەبیستێت، ئەوسا کەسێکی تەقواکار ولە خواترسی لێدەردەچێت، ئەوسا دەبینی دەستپاکی دەمپاکی وداوێنپاکی لێدەردەچێت، چونکە دەزانێت کە خوای گەورە دەیبینێت.

## تەوحیدی پەرەستراوێتی

## «توحيد الألوهية»

ئەم جۆرە واتە: بە تەنها خواپەرەستن، یانی: هەرچی عیبادەتە بە تەنها بۆ خوا بکرێ، بەو مانایەی: هەرچی کاری بەندە هەیە

ـەو شتانەی عیبادەتن بۆ جگە لەخوای نەکات، نوێژ وڕۆژ
ۆزەکات وحەج وجیهاد وسەدەقە وسەربڕین وپاڕانەوە وترسان
ۆئومێدبوون وپشت بەستن وسەرتاشین ونەزرکردن وهتد.. هەمو
ئەمانە بۆ جگە لە خوای بکەی، یان بۆ خوا وجگە لەخوای بکەی
هاوبەش بڕیاردانە وبێباوەڕیە.

## ئەم دوو جۆرەی تەوحید بەس نیە وئەبێ بە تەنها خوا بپەرەستین

بەرێزەکانم ..

به تەوحیدی پەروەردگاریەتی بە تەنها ئیمان دروست نابێت،
مەگەر دەبێت بڕوات بەم جۆری سێیەمەی تەوحیدیش هەبێت،
بەڵێ تەوحیدی پەروەردگاریەتی پلە وگەورەیی زۆری هەیە، بەڵام
مەبەست لە هاتنی پەیامبەران ئەو جۆرەی تەوحید نیە، بەڵکو
مەبەست تەوحیدی پەرەستنە.

بەڵام ئەوەی جێی ئەسەف وداخە دەبینین زۆربەی گروپە لاڕێ
بوەکان ئەوەندەی جەخت لەسەر تەوحیدی پەروەردگارێتی
دەکەنەوە، ئەوەندە باسی ئەوە ناکەن کە پەیامبەران -علیهم

الصلاة والسلام- بۆ خوا بە تەنها پەرستی هاتون، کتێبە ئاسمانیەکان بەو هۆیەوە دابەزێنراوە.

ئەگەر کەسێك تەنها بڕوای بە تەوحیدی پەروەردگارێتی هەبێت، پێی نابێتە موسڵمان، چونکە ئەبو جەهل وئەبو لەهەب -وەك باسمان کرد- بڕوایان بە تەوحیدی پەروەردگاریەتی هەبوە، بەڵام ئایا پەیامبەری خوا ﷺ ناوی لێنان موسڵمان؟ نەخێر!

کەواتە: ئینسان کە باوەڕی بەبونی خوا هەبوو موسڵمان نەبوە، کە بڕوای وابو خوا هەموو شتێکی بەدەستە، بەوە نابێتە موسڵمان، بەڵکو پەیامبەری خوا ﷺ ئەوەی لێوەرنەگرتن تا تەسلیمی تەوحیدی پەرەستراویەتی بوون.

پێشتر باسمان کرد کە لە مێژوودا نەبوە، هیچ کۆمەڵ وگروپێك بڕوایان بە تەوحیدی پەروەردگاریەتی نەبێ، ئەوە نەبێ فیرعەون بە دەم نکوڵی کردوە، لەگەڵ دەهریەکان وشوعیەکانی سەردەمی خۆمان.

ئەوانیش هەر بڕوایان پێی هەبوو، بەڵام تەنها ناویان لە خودای هەق نا سروشت ومادده، ئێمە ئەڵێین خوا زانایە وخوا بەدیهێنەرە، ئەوان ئەڵێین سروشت زانایە وسروشت بەدیهێنەرە،

ئەمەش شەیتان بوو فریوی دان بۆ ئەوەی بەرەو بەهەشت نەڕۆن وبەرەو دۆزەخ بڕۆن.

**هەروەها کۆمەڵێك گروپیش هەبوون لە تەوحیدی پەروەردگاریەتی شرکیان بڕیاردا ولایاندا، ئەم گروپانەش هەر بەخێرایی هەندێکیان باس دەکەم، لەوانە:**

١. **قەدەریەکان:** پێیان وابوو مرۆڤ خۆی کردەوەکانی خۆی دروستدەکات، خوا ﷻ توانای ناشکێ بەسەر کار وکردەوەی بەندەدا.

جا باسمان کرد کە خوا بە تەنهاڕاگرتن لە دروستکردن ئەوە تەوحیدی پەروەردگاریێتیە.

٢. **سۆفیە زیادەڕۆکان «غلاة المتصوفة»:** پێیان وابوو کۆمەڵێك وەلی وپیاوچاك هەیە، «القطب، الأوتاد، النجباء، الأبدال» کە پلەیان بەرزە لای خوا، ئەمانە کۆمەڵێك کاری سەر زەوی ئەمان بەرێوە دەبەن، هەروەها پێویستی خەڵك جێبەجێ ئەکەن، سود وقازانج ئەگەیەنن، ئەی نەتان بیستوە کە دەڵێن: ئەو ئیشە مەکە چونکە فلانە پیاو چاك زەرەرت لێدەدات!! یان قسەی پێنەکەی، ئەگینا خراپت بەسەر دێت یان دەتکوژێت!؟ یان

کوێرت دەکات؟! ئەوانە پێیان وایە جگە لە خوا سود وقازانجی بەدەستە! پەنا بەخوا لەو بیروباوەڕە کوفریە.

ئاخر بەڵکو هەر خوایە لە دەستەڵاتیدا هەیە خەڵك کوێر بکات گەر بیەوێت.

خەڵك کوفر بە خوا دەکات، خوا ﷻ کوێری ناکات، بەس کە قسە بە فلان بکرێت خوا کوێری دەکات!؟ سبحان اللّٰه!

بۆیە بەڕێزەکان وردبن وژیربن، هیچ کەسێك زەرەر وقازانجی بەدەست نیە مەگەر خوا ﷻ نەبێت، هەربۆیە نە هیچ شەخسێك یا قەبرێك یان مەلایەك یا شێخێك زەرەر و قازانجی بەدەست نیە.

**٣. الرافضة** «**شیعە زیادەڕۆکان**»: لە ڕیوایەتەکانی مەزهەبیاندا هاتوە، لەوانە: کتێبی «الکافي»[1] وهتد.. دەڵێ: «پێشەواکانمان پێش ئەوە بمرن خوای گەورە داوای ئیزنیان لێدەکات کە بمرن یان جارێك بژین!».

---

[1] کتێبی کافی لای شیعەکان گەورەترین وبەرزترین کتێبە، ناوی نووسەرەکەی موحەمەدی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقە، ئەبو جەعفەری کولەینیە. [ئامادەکار]

هەروەها دەڵێن: «پێشەواکانمان دەزانن چی ئەبێت ودەشزانن چی بوە لەپێشتر».

بەڕاستی ئەمانە عیلمی غەیبن، تەنها خوا دەیانزانێت -تبارك وتعالی-.

هەروەها دەڵێن: «پێشەواکانمان زەرەر گەیەنەر وسود گەیەنەرن».

**٤. مەجوسی وزەردەشتیەکان:** چونکە باوەڕیان بە دوو ئیلاه هەیە، ئیلاهی ڕوناکی وئیلاهی تاریکی، ئیلاهی خێر وئیلاهی شەڕ.

**٥. ئەوانەی پێیان وایە خوا حاکم نیە:** چونکە یەکێك لە ئاسارەکانی ڕبوبیەتی خوا کە هەر ئەو پەروەردگارە، بڕوابوونە بە: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ [الأعراف:٥٤]. واتە: «جا ئاگادار بن چۆن خوا هەر خۆی دروستکارە هەر خۆی فەرمان دەکات وحەڵاڵ وحەرام دەکات، چونکە دروستکارەکەتان زاناترە بە ئێوە».

**٦. گاوەرەکان:** چونکە پێیان وایە عیساش ئیلاهە، وسێیەمی سیانەکەیە، ئەمەش دژ وەستانەوەیەکی ڕونی تەوحیدی پەروەردگارێتیە.

## لە کۆتاییدا

داوادەکەم لە خوای پەروەردگار، پەرەستراوی هەق، کە بمانکاتە کەسێکی یەکخواپەرستی پاك وڕاستەقینە، لە خوا دەپاڕێمەوە بەفەڵ وکەڕەمی خۆی، هیدایەتی دڵمان بدا بۆ سەر ئەو ڕاستە شەقامەی هیدایەتی پەیامبەران وڕاستگۆیان وشەهیدان وپیاوچاکانی داوە بۆ سەری...

آمین

# پێڕست